# ئافرەت

## لە شارستانیتی ئیسلامی دا

### لە نێوان دەقە شەرعیەکان و بەرهەمی فیقهی و واقیعی ژیاندا


نووسینی
دکتۆر علی جمعە محمد

وەرگێرانی
أمجد محمد زاهد




# ئافــــرەت

## لە شارستانێتی ئیسلامیدا

### لە نێوان دەقە شەرعیەکان وبەرهەمی فیقهی و واقیعی ژیاندا


دانانی

الدكتور علي جمعة محمد

موفتی ولاتی (مصر)

وەرگێڕانی

أمجد محمد زاهد شێخ محمد

پێداچوونەوەی

د. حسن خالد مصطفی المفتي




ناوی کتێب بەکوردی: ئافرەت لە شارستانێتی ئیسلامیدا
نوسینـــــــــــی: دکتۆر علی جمعه محمد
وەرگێڕانـــــــــی: امجد محمد زاهد شێخ محمد
بڵاوکردنـــــــەوەی: نوسـینگەی تەفسـیر بـۆ بڵاوکردنـەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
نەخشەسازی نـاوەوە: جمعه صدیق کاکە
خـــــــــە ت: نەوزاد کۆیی
بـــــــــەرگ : أمین مخلص
نـۆرە و سـاڵی چـاپ: یەکەم ١٤٣١ك — ٢٠١٠ز
تـــــــــیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٥٠٥)ی ساڵی ٢٠١٠ پێدراوە

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨- ٢٥١٨١٢٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٢٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس وستایشی بێ پایان بۆ پەروەردگار، درووود ورەحمەتی نەبڕاوە بۆسەر گیانی پاکی {**محمد المصطفى** (صلى الله عليه وسلم)}، پاشان بۆسەر یار ویاوەر وگشت ئیمانداران.

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾التوبة١٢٢. پێغەمبەریش دەفەرموێت: {**من يرد الله به خيراً يفقهه في الدين**}. لەسەر تیشکی ئەم دوو فەرموودە وهاووێنەکانیان، لە دێر زەمانەوە زانایانی ئیسلام گرنگی وبایەخێکی زۆریان داوە بە بواری خزمەت کردن بە زانستە شەرعیەکان وخەڵکیان لێ بەهرەمەند کردووە، چونکە پاداشتێکی یەکجار زۆری هەیە، وسەعادەتی هەردوو دونیای لەسەر پەیوەندە.. بەتایبەت لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆدا، کە ئیسلام وموسوڵمانی ڕاستەقینە خەریکن غەریب دەبنەوە، ولە دەیان لاوە چەواشەکاری وگومڕایی بە بەرنامەی بەرفراوان دوژمنانی ئیسلام بە هەموو هێز وتوانایەکیانەوە گەرمکیانە لە شەوکەتی بەرزی ئیسلام وموسوڵمانان کەم بکەنەوە، ولەکەداریان بکەن، بەتایبەتی لە بوارەکانی ئافرەت ومافەکانی..

برای بەڕێز وخۆشەویستم مامۆستا (**امجد محمد زاهد**) لەم بوارەدا هەستاوە بە وەرگێڕانی یەکێك لە نوسراوەکانی موفتی وڵاتی میسر، مامۆستای پایەبەرز (**د. علي جمعة**) بەناونیشانی (**المرأة في الحضارة الإسلامية بين نصوص الشرع وتراث الفقه والواقع المعيش**)، کەپێم وایە هەم مامۆستای دانەر، و هەم مامۆستای وەرگێڕ، هەردووکیان زۆر سەرکەوتوون لە کارەکانیاندا، وتا

ئەندازەیـەکی زۆر بـاش مەبەسـتەکانیان پێکـاوە.. خـوا پاداشـتی بـەخێریان بداتەوە..

بەندەش کە لەلایـەن بـرای وەرگێـڕەوە تـەکلیفم لێ کـرا، بـە هەڵسەنگاندنی دەقـە عەرەبیەکـە، وپێداچوونەوەی دەقـی وەرگێـڕدراو، منـیش لەبـەر گرنگـی بابەتەکـە، وخۆشەویستیم بـۆ مامۆسـتا (أمجد)، نـەمتوانی جگـە لـە جێبـەجێ کردن، هیچ بواری ترم نەبوو.. سوپاس بۆ خوا..

لە کۆتاییدا داواکارم لە پەروەردگار کە نموونەی ئەم بەڕێزە، وگەنجانی تری پێنـووس ڕەنگـین وفیـداکار وخزمـەتگوزار بپارێزێـت، وبیانگەیەنێتـە لوتکـەی ئاوات لە هەردوو دونیا.

د. حسن خالد مصطفى المفتي
کۆلیژی زانستە ئیسلامیەکان
هەولێر/ ٨/ ٤/ ٢٠١٠ ی زاینی

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی وەرگێڕ:

پاش سوپاس وستایشی بێ پایان بۆ بەدیهێنەری زەوی وئاسمان، درووود وسەلام بۆ سەر گیانی پاکی سەرداری پێغەمبەران، پێشەوا وڕابەر وسەرکردە، (محمد) پێغەمبەری ئاخر زەمان، بۆ سەر گیانی تەواوی ئال وبەیت ویار ویاوەران، وهەموو ئەو کەسانەش کە دەست بە بەرنامەی خواوە دەگرن تاکو دونیا کۆتایی دێ، وهەمووش بە کردەوەی خۆمان ئەچینەوە بەردەم یەزدان، لەپاشان:

ماوەیەك دەمویست باسێك بنووسم لەسەر میراتی ئافرەت لە ئیسلامدا، بە تایبەتی لەسەر ئەو بەناو ڕەخنەیەی کە ڕووبەڕووی ئەم بەرنامە ڕاستە خواییە کراوەتەوە، کە گوایە ئافرەت نیوەی پیاو میرات دەبات!! جا لەو کاتەدا مەبەستم بوو کە زۆرترین سەرچاوە پەیدا بکەم بۆ نووسینی باسەکەم، ئەوەبوو ڕۆژێك ئەم کتێبەی مامۆستای زانا، موفتی وڵاتی (مصر) (علي جمعة محمد)م بەرچاو کەوت، بەناونیشانی (المرأة في الحضارة الإسلامية بين نصوص الشرع وتراث الفقه والواقع المعيش)، کە لە ناوەڕۆکەکەیم ڕوانی، بینیم کە ئەو باسەی زۆر بە باشی هێناوە، بۆیە دەست بەجێ کڕیم، ولە ڕاستیشدا سوودێکی باشم لێ بینی.

بەڵام دواتر بینیم کە ئەم کتێبە چەند بابەتێکی تری هەستیاری لەخۆ گرتووە، کە جێگەی باس وخواسی کەسانی شارەزا ونەشارەزای ئەم ئاینە پیرۆزەن، شارەزاکان ڕوونیان دەکەنەوە، ونەشارەزاکانیش بە نەزانینی خۆیان ڕەخنە دەگرن. بۆیە بیرم کردەوە لەوەی کە وەری بگێڕمە سەر زمانی شیرینی

کوردی، تاوەکو لە لایەك کەلێنێکی کتێبخانەی کوردی پڕبکاتەوە، ولەلایەکی تریشەوە ئەو برا وخوشکە بەڕێزانەی کە لە زانینی زمانی عەرەبیدا کەم توانان یان بێ توانان، بتوانن تا ڕادەیەك بەم بابەتانەو وردەکاریەکانیان ئاشنابن.

مامۆستای دانەر لە سێ لایەنەوە باسی لە ئافرەت کردووە:

١. لە دەقە شەرعیەکانی قورئان وفەرموودەکانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم).

٢. لە بەرهەم وسەرچاوە وکتێبە فیقهی وشەرعیەکاندا. کە ئەم دوو باسەیان لە زۆرێك لەو کتێبانەدا هەن کە باس لە ماف وڕێزی ئافرەت دەکەن لە ئیسلامدا، بەلأم مامۆستا بە شێوازێکی زانستیانە وتازە وبەسوود باسی کردوون.

٣. لە واقیعی ژیان ومێژووی گەل ونەتەوە وکەسەکاندا، کە ئەمەیان کەمتر بەرچاو دەکەوێت لە کتێبەکانی تردا.

بەلأم ئەوەندە دەڵێم: سەرەڕای وەرگێڕانی ئەم کتێبە، من هەوڵم داوە بۆ زیاتر بەهێز کردن ودەوڵەمەند کردنی بابەتەکان، چوار کاری تریش بکەم:

- زۆرینەی زانیاریەکانی ناو ئەم کتێبە، هەوڵم داوە لە چەند سەرچاوەی تریشدا هاتبن، ئاماژەیان پێ بکەم.
- هەر ئایەتێکی قورئانی پیرۆزی تێدا هاتبێت، تەفسیرەکەیم نووسیوە، بە پشت بەستن بە هەردوو تەفسیری (خوڵاصەی تەفسیری نامی/ مامۆستا عبد الکریمی مودەڕیس، وتەفسیری گوڵشەن/ دکتۆر نظام الدین عبد الحمید).
- تەخریجی حەدیس و فەرموودەکانی پێغەمبەرم (صلی الله علیه وسلم) کردووە، بە جۆرێك کە ناوی ئەو سەرچاوانەم نووسیووە، کە

فەرموودەکەیان تێدایە، ناوی بەش، وبابەتەکان، وژمارەی فەرموودەکەش لەو سەرچاوانەدا.

- لە هەندێك جێگەدا هەستاوم بە لێکۆڵینەوە ولێوردبوونەوەی مەسئەلەکان.

جا بەو پێیەی کە مەرج نییە کەسی وەرگێڕ بە تەواوەتی هاوڕا وهاو بۆچوونی کەسی دانەر بێت، بۆیە بە پشت بەستن بە سەرچاوە شەرعییە متمانەدارەکان هەندێك تێبینیم لەسەر هەندێك لە بۆچوونەکانی مامۆستای موفتی هەیە، کە ئاماژەم پێکردوون، وهیوادارم بەهەڵەدا نەچووبم.

لە کۆتاییدا هیوام وایە کە مایەی سوودی موسوڵمانانی کورد زمان بێت، وزۆر سوپاسی مامۆستا وبرای زۆر خۆشەویستم دکتۆر شێخ حەسەنی موفتی دەکەم، کە ئەرکی پیاچوونەوەی ئەم وەرگێڕانەی خستە ئەستۆی خۆی، خوای گەورە پاداشتی بەخێری بداتەوە، وبە کەرەمی خۆشی ئەم کارەمان لێ وەرگرێت. آمین.

وەرگێڕ

**امجد محمد زاهد شیخ محمد**

## بە ناوی خوای بەخشندە ومیهرەبانەوە

# پێشەکی دانەر:

سوپاس وستایش بۆ پەروەردگاری هەموو جیهان، ودروود وسەلام لەسەر سەرداری پێغەمبەران، گەورە وپێشەوامان پێغەمبەری ئەمین محمد (صلی الله علیه وسلم) و لەسەر یار ویاوەر وهاوەڵانی بە تێکڕا. پاشان:

پرسیارێکی زۆر دەکرێت لە بارەی پێگە وجێگەی ئافرەت لە ئیسلامدا، ئەمەش وامان لێ دەکات کە بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەکانی ئەم ئاینە، وبەرهەمی بیر وهزری زانایان، وواقیعی مێژوویی وئێستای ژیانیان.

ئافرەتیش یەکێکە لە دوو جۆرەکەی ڕەگەزی مرۆڤایەتی، کە خوای گەورە ڕێزێکی زۆری لێ ناوە وپلە وپایەی بەرزی پێداوە بەسەر تەواوی درووستکراوەکانی تردا، وەك خوای دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا﴾ الأسراء/٧٠. ((واتە: ئێمە قەدری نەوەی ئادەممان گرتوە وشەرمەندارمان کردوون بەوەی هۆش وبیرمان پێ بەخشیوون، هەروەها بەو توانای فێربوون وزانینەی کە پێمان بەخشیون، لەسەر وشکانی ولە ناو دەریادا هەڵمان گرتوون تا بە ئاسانی بێن وبڕۆن. لە گشت جۆرە ڕزق وڕۆزییەکی چاك وپاك بەشمان داون و، پلەو پایەمان بەسەر گەلێك لە درووستکراوەکانی تردا بەرز کردوونەتەوە)).

گومانی تێدا نییە کە ئەم ڕێزلێنانە داگرەوەیە بەسەر هەردوو ڕەگەزی نێرینە ومێیینەدا، واتە نێرینە وەك مرۆڤ ڕێزی لێگیراوە، ومێیینەش بە هەمان شێوە.

خوای گەورەش کە ڕێزی لە ئافرەت ناوە هەموو مافەکانی پێداوە وهیچ ستەمێکیشی لێ نەکردووە، وئەرکی وەهای نەداوە بەسەریدا کە لە توانایدا نەبێت، چونکە خوای گەورە خۆی درووستی کردووە، وهەر خۆشی دەزانێت کە چی جۆرە ماف وئەرکێك بۆ ئافرەت گونجاوە، وەك دەفەرموێت: ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ الملـــك/١٤. ((واتە: ئەو خودایەی کە عالەمی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون ودرووستی کردووە، ئایا نازانێت چی لە ناو دڵتاندا دەشارنەوە وچیش ئاشکرا دەکەن؟! لە حاڵەتێکدا ئەو خودایە کە زانینی دەوری هەموو شتێکی داوە، هەرچەندە ئەو شتانە زۆر ورد وشاراوە وپەنهانیش بن)).

کەواتە باسی دادپەروەرانە مامەڵە کردن لەگەڵ ئافرەتدا پێویستە بە شێوەیەکی تەواو باس بکرێت، بە جۆرێك کە هەم ماف وهەم ئەرکەکانیش بگرێتەوە، چونکە خوای گەورە کە مرۆڤی درووست کردووە، هەروا بێ هوودە نەبووە، بە جۆرێك کە کۆمەڵێك مافی بداتێ، بە بێ ئەوەی کە هیچ ئەرکێکی بەسەردا بدات، وەك خوای دەفەرموێت: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾ المؤمنون/١١٥. ((واتە: ئایا وا تێدەگەن ئێوەم بەبێ هوودە وبێ هیچ مەبەستێك وبۆ گاڵتە ویاری درووست کردووە؟! واتان دەزانی کە ڕۆژی دوایی نایەت وناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە، تا لەسەر بیر وباوەڕ وگوفتار ورەفتارەکانتان لێتان بپرسینەوە؟! تا هەرکەسەو بە پێی بیر وباوەڕ وکردەوەی خۆی جەزای بدرێتەوە)).

هەروەها هەندێك ڕاستی هەن کە پێویستە لە بیر ودڵی هەموو موسوڵمانێکدا بچەسپێن وجێگیر بن، وەك لە چەند جێگەیەکی قورئانی پیرۆزدا هاتووە، لەوانە:

- ﴿وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾ الكهف/٤٩. ((واتە: پەروەردگارت ستەم لە هیچ کەسێك ناکات))
- ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا﴾ النساء/٤٩. ((واتە: ئەوەندەی ئەو درزە باریکەی کە لە ناو دەنکی خورمادایە، ستەم لە هیچ کەسێك ناکرێت))
- ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ الحج/١٠. ((واتە: بێ گومان خودا ستەم لە هیچ بەندەیەك ناکات))
- ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ﴾ العنكبوت/٤٠. ((واتە: وەنەبێت خودا ستەمی لەو گەلانە کردبێت))
- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ﴾ النساء/٤٠. ((واتە: بێ گومان ئەوەندەی قورسایی گەردیلەیەك خودا ستەم لە کەس ناکات))
- ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا﴾ النساء/١٢٤. ((واتە: ئەوەندەی چالآیی پشت ناوکی دەنکە خورمایەك ستەمی لێ ناکرێت))
- ﴿فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ﴾ التوبة/٧٠. ((واتە: وەنەبێت خودا ستەمی لێ کردبن)).

جا تەواوی ئەم ئایەتانە وزۆرێکی تریش دووپاتی ئەو ڕاستیە گرنگە دەکەنەوە کە پێویستە بە باشی بچەسپێت لە بیروباوەڕی هەموو موسوڵمانێکدا، کە شایەتی داوە بە یەکتایی خودای گەورە، و پێغەمبەرایەتی گەورە وپێشەوامان محمد (صلی الله علیه وسلم)، ئەویش ئەوەیە کە داد وعەدالەتی خوای گەورە تەواو ڕەهایە، ولەو بەرنامەی کە ناردوویەتی هیچ جۆرە ستەمێکی سەبارەت بە هیچ کەسێك، بەڵکو بۆ هیچ جۆرە درووست کراو وبوونەوەرێکیش تێدا نییە، بڕیارەکانی خوای گەورەش نابێت بە تەرازوو وپێوەری مرۆڤەکان بپێورێن، بەڵکو پێوەری خوایی دەبێتە پێوەری هەموو کردەوەکانی ئەوان.

وە ئـەو کێشـەیەی کـە لـەم ڕۆژانـەی ئێسـتاماندا ڕوو بـە ڕووی دەبینـەوە ئەوەیە کە: باسـی ئـافرەت ومافـەکانی لـە شـەریعەتی ئیسلامدا بوەتـە جێگـەی مشـتومڕ ونـاکۆکی لەگـەڵ ئـەو کەسـانەی کـە نـە دەزانـن حەقیقـەتی ئـافرەت چییە! ونە شارەزاییشیان سەبارەت بەم شەریعەتە پیرۆزە وڕاسـتیەکانی هەیـە، بـە جۆرێـك کـە وەك گفتووگـۆ کردنـی لێ هـاتووە لەگـەڵ ئـەو کەسـانەی کـە گوێیان گرانە وهەستی بیستنیان تێك چووە وبە باشی ڕاستیەکان نابیستن.

منیش ئەم واقیعە ئازاراوییە پاڵی پێوەنـام بـۆ ئـەوەی باسێك کۆ بکەمـەوە لەسەر ئافرەتی موسوڵمان لە سەرچاوە شەرعیەکان وواقیعی مێژووییان، ونـاوم لێنا: (ئافرەتی موسوڵمان لـە سەرچـاوەکانی شـەریعەت وواقیعـی مێژووییـدا)[1] دابەشم کرد بۆ چەند بەشێك:

<u>دەروازەی یەکەم</u> : ئـافرەتی موسـوڵمان لـە دەقـە پیرۆزەکـانی شـەرعدا، کە دوو بەش لە خۆ دەگرێت:

بەشی یەکەم : ئافرەت لە قورئانی پیرۆزدا.

بەشی دووەم : ئـافرەت لـە سـونەت وفـەرموودەکانی پێغەمبـەردا (صلى الله عليه وسلم).

<u>دەروازەی دووەم</u> : ئـافرەتی موسـوڵمان لـە بەرهـەم ونوسـراوە فیقهیەکانـدا، کە هەشت بەش لە خۆ دەگرێت:

بەشی یەکەم : میراتـی ئـافرەت لـە نێـوان ڕاسـتیەکان ودرۆ هەڵبەسراوەکاندا.

بەشی دووەم : شـایەتی دانـی ئـافرەتی موسـوڵمان وڕەد کردنـەوەی گومانە درووست کراوەکان.

بەشی سێیەم : فرەژنی وحەقیقەتەکەی.

---

(١) هەرچەندە لە بەرگی کتێبەکەیدا بە شێوازێکی تر ناونیشانی کتێبەکـەی هاتووە، وەك لە پێشەکی وەرگێڕانەکەدا ئاماژەمان بۆ کرد. وەرگێڕ

بەشی چوارەم : مافی ئافرەت لە هەڵبژاردنی مێردی خۆیدا.
بەشی پێنجەم : پێشنوێژی کردنی ئافرەت.
بەشی شەشەم : خەتەنە کردنی مێیینە.
بەشی حەوتەم : مافە سیاسیەکانی ئافرەت.
بەشی هەشتەم : لێدانی ئافرەت لە ئیسلامدا.

دەروازەی سێیەم : ئافرەتی موسوڵمان لە واقیعی مێژووییدا، کە پێنج بەش لە خۆ دەگرێت:

بەشی یەکەم : ئافرەتگەلێکی حوکمڕان (حاکم).
بەشی دووەم : ئافرەتگەلێکی دادوەر (قاضي).
بەشی سێیەم : ئافرەتگەلێکی جەنگاوەر.
بەشی چوارەم : ئافرەتگەلێکی موفتی وزانا.
بەشی پێنجەم : ئافرەتگەلێك کە دەسەلآتی جێبەجی کردنیان گرتۆتە دەست (السلطة التنفيذية).

کۆتایی : بار ودۆخی ئافرەتی ناموسوڵمان لە کۆن ونوێدا.

# دەروازەی یەکەم

# ئافرەتی موسوڵمان
# لە دەقە پیرۆزەکانی شەرعدا

**کە دەسپێکێك ودوو بەش لە خۆ دەگرێت:**

**بەشی یەکەم : ئافرەت لە قورئانی پیرۆزدا.**

**بەشی دووەم : ئافرەت لە سونەت وفەرموودەکانی پێغەمبەردا**

## دەسپێك

زۆرێك لە دەقەكانی قورئانی پیرۆز وفەرموودەكانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) موسوڵمانان هاندەدەن لەسەر پارێزگاری كردن وپاراستنی ئافرەتان وبە یەكسان تەماشا كردنیان لەگەڵ پیاواندا، وچاودێری كردنی مافەكانیان، ئامۆژگاری و ڕاسپێریشان تێدایە بەوەی كە چاكەیان لەگەڵدا بكرێت، وبە باشی مامەڵەیان لەگەڵدا بكرێت، بەهۆی ئەو نەرم ونیانی وشەرم كردنەی كە لەواندا هەیە، كە هەندێك جار وەك بەربەستێكی لێدێت لە نێوان ئەوان وداواكردنی مافەكانیان.

جا ئێمەش لەم دوو بەشەی كە دێت دەقی ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز وفەرموودەكانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەو بارەیەوە دەهێنین.

# بەشی یەکەم

## ئافرەت لە قورئانی پیرۆزدا

خوای گەورە لە بنەما وئەصڵی درووست کردنـدا پیـاو وئـافرەتی یەکسان کردووە، وجیاوازی نەکردووە لە نێوانیانـدا، وەك هـەواڵی پێداوین کـە ئەصڵی هەموو مرۆڤەکان یەکە، وهەر لەویشەوە تەواوی نێرینە ومێیینەکانی درووست کردووە، وەك لە چەند جێگەیەکی قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

• ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَ﴾ النساء/١ ((واتە: ئـەی خەڵکینـە، خۆتان لە نارەزایی خوداتان بپارێزن وپارێزکار بن، ئەو خودایەی کە ئێوەی لە نەبوونەوە بە نێر وبە مـێ لـە یـەك جەستـە ویـەك گیـان هێناوەتـە دی. خـودا لـەو دوو کەســەوە گـەلێك پیـاو وئـافرەتی خولقانـدووە وپـرژوبڵاوی کردوونـەتەوە بەسەر ڕووی زەویـدا، خـودا بپەرسـتن وپارێزکـار بـن کـە ئـەم گشت مرۆڤە بە هۆشـەی لـە دوو کـەس هێناوەتـە بـوون، ئـەو خودایـەی کـە ئێـوە بـە نـاوی ئـەوەوە داوای ئەنجامـدانی کـار لـە یـەکتری دەکـەن، خۆتـان بپارێزن لە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی)).

• ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ فَمُسۡتَقَرّٞ وَمُسۡتَوۡدَعٞۗ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَفۡقَهُونَ﴾ الأنعام/٩٨ ((واتە: هەر ئەو خودایە ئێـوەی لـە خـاوەن گیانێـك خولقاندووە وپاشان زۆری کردوون ونەوە ووەچەی زۆری لێ خستوونەتەوە. (فَمُستَقَرٌ وَمُستَودَع) هەنـدێك لـە زانایـان دەڵـێن: مەبەسـت بـە (مُستَقَرٌ)

جێگیر بوونە لە دنیادا، هەریەکەو بەپێی تەمەنی خۆی لەسەر ڕووی زەوی. هەروەها مەبەستیش لە (مُستَوْدَع) کۆبوونەوەیە لە ژێر زەویدا بەهۆی مردن وئەسپەردە کردنەوە. هەندێکی تریش دەڵێن: (مُستقَرُّ) ئەو جێگەیە کە لە لەشی پیاودا نوتفەی تێدا جێگیر دەبێت. (مُستَوْدَع)یش بەو جێگایە دەڵێن لە ڕەحمی ئافرەتدا کە نوتفەکەی لەگەڵ نوتفەی پیاودا بە یەکتری دەگەن ویەکدەگرن وسەرەنجام منداڵی لێ درووست دەبێت. (قد فصّلنا..) واتە: بەڕاستی ئێمە بە وردی باسی درووست کردنی ئادەمیزادمان ڕوون کردووەتەوە، بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی خاوەن بیر وهۆش وتێگەیشتوون بیر لە توانا ودەسەلاتی سەرسوورهێنەری خودا بکەنەوە وبزانن توانا وگەورەیی خودا بێ سنوورە)).

- ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا ﴾ الأعراف/١٨٩ ((واتە: ئەو خودایەی کە ئێوەی لە یەك گیان درووست کردووە ـ مەبەست باوە ئادەمە ـ هەروەها هاوسەرەکەیشی هەر لەو درووست کردووە، تاوەکو لەگەڵیدا بژی پێکەوە ئولفەت بگرن)).
- ﴿خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا ﴾ الزمر/٦ ((واتە: خودا ئێوەی لە گیانی ئادەم درووست کردووە، هەر لە ئادەمیش خێزانەکەی (واتە: حەووا)ی درووست کردووە)).

هەروەها لە ئەصڵی بەندایەتی کردن وئەرکە شەرعیەکانیشدا یەکسانی کردون، وفەزڵ وگەورەیی هیچ ڕەگەزێکیانی نەداوە بەسەر ئەوی تریاندا، بەڵکو تەنها پێوەرێك کە داینادە بۆ جیاوازی کردن لە نێوانیاندا، بە جۆرێك کە کامیان لە کامیان لە پێش تر وبە ڕێز تربێت بریتیە لە: پێوەری لە خوا ترسان وچاکەکاری وچاکسازی، وەك دەفەرموێت:

• ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ﴾ الحجرات/١٣. ((واتە: ئەی خەڵکینە، ئێمە ئێوەمان لە نێر ومێیەك درووست كردووەو، كردوومانن بە چەند هۆز وعەشیرەت وقەومێكەوە، تا بە برایەتی وخۆشەویستییەوە لەگەڵ یەكتردا مامەڵە بكەن، بێگومان باشترین كەستان لەلای خودا ئەو كەسەتانە كە لە هەمووتان پارێزكار تر ولە خودا ترس تر بێت، بە ڕاستی خودا بە كار وكردەوەكانتان زۆر زانا وئاگادارە)).

وە ئافرەت وپیاوی یەكسان كردووە بەڵكو هەموو مرۆڤەكانی یەكسان كردووە لە ئەصڵی بەندایەتی كردندا، وەك دەفەرموێت:

• ﴿إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدٗا﴾ مـــــريم/٩٣ ((واتـە: هەرچی لە ئاسمانەكان وزەویدا هەیە هەموویان بەندەی خودان، وئەو بەدی هێناون و، لە ژێر بڕیار وفەرمانی خودادان، وبە پێی نەخشە وپلانی ئەو بەڕێوە دەچن)).

وە ئافرەتان وپیاوانی یەكسان كردووە لە ئەصڵی ئەركە شەرعیەكان، وپاداشت وسزا لەسەر كردن ونەكردنیان، وەك لە چەند ئایەتێكدا دەفەرموێت:

• ﴿مَنۡ عَمِلَ سَيِّئَةٗ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَاۖ وَمَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ يُرۡزَقُونَ فِيهَا بِغَيۡرِ حِسَابٖ﴾ غـــــافر/٤٠

((واتە: هەر كەسێك لەم ژیانەی ئێستایدا كردەوەی خراپ ئەنجام بدات، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا هەر بە پێی كردەوە خراپەكانی خۆی سزای دەدرێت، بە بێ هیچ زیادەیەك. هەر كەسێكیش ـ چ پیاو بێت، یان ئافرەت ـ باوەڕی بە خودا وبە فەرمان وفەرمایشتەكانی خودا هەبووبێت وكەسێكی چاكەكار بووبێت، وبە پێی بەرنامەی خودا ژیانی خۆی بردبێتە سەر، ئەوە ئەوانەیش دەچنە بەهەشتی ڕازاوەوە، پاداشتی زۆر چاكتر وزۆرتر لە

کردەوەکانی خۆیانیان بەبێ حیساب پێ دەبەخشرێت، وەمتا هەتایە لە بەهەشتی نەبڕاوەدا بۆ خۆیان ڕادەبوێرن))

• ﴿فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ﴾ آل عمران/١٩٥ ((واتە: خودا دوعا وپاڕانەوەی دوعاخوازانی گیرا کرد، وفەرمووی: من کردەوەی چاکی هیچ کەسێکتان بزر ناکەم، جا کەسەکە نێرینە بێت یان مێیینە، چونکە هەندێکتان هاوکاری یەکن وئەگەر جیاوازی بیر وباوەڕ وکردەوە لە نێوانیاندا نەبێت، ئەوە خۆیان جیاوازیان لە نێواندا نییە))

• ﴿وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ نَقِيرٗا﴾ النساء/١٢٤ ((واتە: هەر کەسێك لە نێر ولە مێ ئەگەر کردەوە چاکەکان بکات وخۆی لە خراپە بپارێزێت و، خاوەنی باوەڕێکی ڕاست ودرووست بێت، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا بە چوونە ناو بەهەشت دڵخۆش دەبێت، وئەوەندەی چاڵایی پشت ناوکی دەنکە خورمایەك ستەمی لێ ناکرێت)).

• ﴿مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ النحل/ ٩٧ ((واتە: هەر ئیماندارێك ـ نێرینە بێت یان مێیینە ـ کار وکردەوەی چاك بکات، ئەوە لە دنیادا بە کامەرانی وشادی دەیژێنین، لە ڕۆژی دواییشدا بە گەلێك باشتر لەوەی دەیانکرد پاداشتیان دەدەینەوە)).

هەروەك چۆن یەکسانی کردون لە ئەصڵی ماف وئەرکەکاندا، وەك دەفەرموێت:

• ﴿وَلَهُنَّ مِثۡلُ ٱلَّذِي عَلَيۡهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ﴾ البقرة/٢٢٨. ((واتە: ژن ومێرد حەقی چاکەیان بەسەر یەکتریەوە هەیە)).

• ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾ النساء/٧. ((واتە: هەموو نێرینەیەك ـ گەورە بێت یان منداڵ ـ لە میراتی دایك وباوك وخزمانی نزیكدا بەشدارە وپشكی هەیە. هەروەها ئافرەتانیش ـ گەورە بن یان منداڵ ـ لە میراتی دایك وباوك وخزمانیدا بەشدارن، جا میراتەكە زۆر بێت یان كەم، ئەمەش خوا بە واجیبی داناوە وبڕیاری لەسەر داوە، بۆیە هەرگیز نابێت لێی لابدرێت)).

وە خوای گەورە ئەو كارەی بە تاوان دانا كە پێشتر عەرەبەكانی سەردەمی نەفامی دەیان كرد، لەوەی كە پێیان ناخۆش بوو خوای گەورە مێینەیان پێ ببەخشێت، وەك دەفەرموێت:

• ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ۚ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾ النحل/٥٨-٥٩. ((واتە: ئەگەر یەكێك لەوانەی كە دەڵێن خودا كچی هەیە، موژدەی بدرێتی كە كچی بووە، دەموچاوی گرژ وتاریك دەبێت، ودڵی پڕ دەبێت لە خەم وتووڕەیی، خۆی لە خزم وناسراوەكانی دەشارێتەوە، چونكە لەبەر تێنەگەیشتوویی خۆی وا دەزانێت عەیبێكی گەورەی لێ قەوماوە، ئینجا سەر دێنێت و سەر دەبات ئایا چی لێ بكات؟! ئایا كچەكە بهێڵێتەوە، كە ئەو بە عەیب وعاری دەزانێت، یان لە ناو خاكدا بیشارێتەوە وزیندە بە چاڵی بكات؟! بەڕاستی ئەو كەسانە لەسەر ڕێگایەكی زۆر خراپن)).

هەروەها دەقەكانی ئەم شەریعەتە پیرۆزە هەر بەوەوە نەوەستاوە كە باس لە یەكسانی نێوان نێرینە ومێینە بكات لە ڕووی ئەرك ومافەكانەوە، بەڵكو لەوە زیاتریش پیاوان ڕادەسپێرێت، وئامۆژگاریان دەكات كە هەڵسوو كەوت ومامەڵەیان باش بێت لەگەڵ ئافرەتاندا، چونكە زۆر جار لەبەر شەرم كردن

ونەرم ونیانی وکەم ڕوویی وەهایان لێ دێت کە داوای مافەکانی خۆشیان ناکەن، وەك خوای گەورە لە چەند جێگەیەکی قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

- ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ ۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ النساء/١٩ ((واتە: بە شێوەیەکی جوان لەگەڵ ئافرەتاندا بژیین، خۆ ئەگەر شتێکی وا ڕوویدا لێیان کە مایەی ناڕەحەتی وبێزاریتان بوو، ئەو کاتە هەراسان مەبن وخێرا هەوڵی جیابوونەوە مەدەن لەگەڵیاندا، چونکە وا دەبێت مرۆڤ ڕقی لە شتێك دەبێتەوە، کەچی خودا ئەو شتە دەکاتە مایەی سوود وقازانجێکی زۆر)).
- ﴿وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ﴾ البقرة/ ٢٣٦ ((واتە: پێویستە بە پێی توانای خۆتان هەندێك سامان ودارایی پێشکەش بە ئافرەتان بکەن، خاوەن سامان بە پێی سامانەکەی، وهەژاریش بە پێی هەژاریەکەی خۆی، ئەمە حەقێکەو دەبێت چاکەکاران بە جوانی ئەو ئەرکە ئەنجام بدەن)).
- ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ ۚ وَإِن كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۖ وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ ۖ﴾ الطلاق/٦ ((واتە: ئەو ئافرەتانەی کە تەڵاقیان دەدەن، لە لایەکی ئەو ماڵ وجێگەی کە خۆتان تیایدا دەژین، نیشتەجێیان بکەن وبە پێی توانا وئیمکاناتی خۆتان ـ تا عیددەیان تەواو دەبێت ـ خەرجیان بکێشن وخواردن وجل وبەرگیان بۆ دابین بکەن، ومەیانخەنە ناو تەنگانە وناخۆشی، بۆ ئەوەی ناچاریان بکەن واز لەو جێگا وڕێگایەی خۆیان بهێنن، وئیتر داوای هیچتان لێ نەکەن. خۆ ئەگەر سکیان پڕ بوو دەبێت جێگا ومەنزڵ وخواردن وجل وبەرگیان بە چاکی بۆ دابین بکەن تا منداڵەکانیان دەبێت. ئینجا ئەگەر دوای منداڵبوونیان ویستیان خۆیان شیر بە

منداڵەکانیان بدەن، ئەوە دەبێت کرێی شیردانەکەیان بدەنێ، باوکان ودایکان پێویستە هەریەکەیان بە جوانی لەگەڵ یەکدا بدوێن وقسە لەسەر چۆنێتی چاودێری کردن وبەخێو کردنی منداڵەکانیان بکەن)).

- ﴿فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً﴾ النساء/٢٤ ((واتە: مارەییەکانی خۆیانیان بە تەواوەتی بدەنێ، ئەو مارەیی پێدانەش فەرزێکی خودایە)).
- ﴿وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ﴾ النور/ ٣٣ ((واتە: لەوماڵەی خودا پێی داون بەشیان بدەن ویارمەتیان بدەن)).
- ﴿فَلَا تَبْغُوا۟ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾ النساء/٣٤ ((واتە: ئەگەر خێزانەکانتان گوێڕایەڵیان کردن، ئیتر ڕێگەیان لێ مەگرن وبەهانەیان پێ مەگرن وسەرزەنشتیان مەکەن، خوای گەورە پایە بەرز وگەورە وبەدەسەڵاتە ـ کەواتە لێی بترسن وخۆتان لە تاوان بپارێزن)).
- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا۟ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا ۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا۟ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ﴾ النساء/١٩ ((واتە: ئەی ئیماندارینە، درووست نییە ژن بە میرات بگرن، چونکە ئەوە ستەمە ومایەی ئازاردانی ئافرەتەکەیە، هەروەها نابێت ڕێگای شووکردنیان لێ بگرن، یاخود زۆریان لێ بکەن ونازاریان بدەن بۆ ئەوەی هەندێك لەو مارەییەی کە پێتان داون لێیان بسێننەوە)).
- ﴿فَإِمْسَاكٌۢ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌۢ بِإِحْسَـٰنٍ ۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا۟ مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا﴾ البقرة/٢٢٩ ((واتە: ئینجا پیاوەکە ـ کە دوو تەڵاقی (ڕیجعی) ژنەکەی داوە ـ یان ئافرەتەکە دەگێڕێتەوە ژێر خەیمەی هاوسەرێتی خۆی، یاخود جارێکی تر تەڵاقی دەدات وبە یەکجاری لە یەکتری جیا دەبنەوە. جا ئەوەی کە لەوەو پێش داویەتی بە ئافرەتەکە نابێت لێی بسێنێتەوە)).

# بەشی دووەم

## ئافرەت لە سونەت وفەرموودەکانی پێغەمبەردا

فەرموودە درەوشاوەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەم بارەوە زۆرن، لەوانە:

- جارێك پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم): کێ خۆشەویست ترین کەسە بەلاتەوە؟ ئەویش فەرمووی: (عائشة).[١]
- لە گێڕانەوەیەکی تردا ولە وەڵامی پرسیارێکی هاوشێودا فەرمووی: (فاطمة).[٢]

جا ئەم دوو فەرمودەیە ئامازە بەوە دەکەن کە ئافرەت جێگەی ڕێز و خۆشەویستییە، جا چ هاوسەر بێت یان کچ، هەر کاتێك کە کەسێکی موسوڵمان زانی کە خۆشەویست ترینی کەسەکان بە لای پێغەمبەر وپێشەوا وسەرکردە

---

(١) البخاري/ كتاب المغازي/ باب غزوة ذات السلاسل/٤١٠٠، ومسلم/ كتاب فضائل الصحابة/ باب من فضائل أبي بكر الصديق/ ٢٣٨٤، والترمذي/ المناقب/ باب فضل عائشة/ ٣٨٨٥، وابن ماجه/ افتتاح الكتاب في الإيمان وفضائل الصحابة والعلم/ باب في فضائل أصحاب رسول الله/ فضل أبي بكر الصديق/ ١٠١، وأحمد في مسنده/ مسند الشاميين/ بقية حديث عمرو بن العاص عن النبي/ ١٧٨٤٤، وابن حبان/ كتاب إخباره صلى الله عليه وسلم عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم/ ٦٨٨٥، والطبراني في المعجم الكبير/ ذكر أزواج رسول الله/ ١١٣، والحاكم في المستدرك/ كتاب معرفة الصحابة/ ذكر مخمر بن حيدة أخوهم الثالث/ ٦٧٤١، والبيهقي في السنن الكبرى/ كتاب قسم الفيء والغنيمة/ باب إعطاء الفيء على الديوان ومن يقع به البداية/ ١٢٨٧٩، والنسائي في السنن الكبرى/ كتاب المناقب/ مناقب أصحاب رسول الله/ فضل أبي بكر الصديق/ ٨١٠٦.

(٢) أحمد في مسنده/ مسند الأنصار/ حديث أسامة بن زيد حب رسول الله/ ٢١٨٢٥، والحاكم في المستدرك/ كتاب معرفة الصحابة/ ذكر مناقب جعفر بن أبي طالب/ ٤٩٥٧.

مەزنەکەیەوە (صلى الله عليه وسلم) بریتییە لە ئافرەت، ئەو کاتە ئەویش ڕێزی ئافرەت دەگرێت، وبە گەورە تەماشای دەکات، چوونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە پێشەنگی خۆی دەزانێت.[1]

- یەکێك لە ڕەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بریتی بوو لەوەی کە دیاری وبەخششی دەنارد بۆ هاوڕێ ودۆستەکانی (خديجة)ی هاوسەر وخێزانی، وەك ئەنەسی کوڕی مالیك بۆمان دەگێڕێتەوە: کە یاریەکیان هێنا بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش فەرمووی: بیبەن

---

(١) ئەو دوو بەڵگەیەی کە مامۆستای دانەر لەسەر ئەم باسە هێناونی بەباشی ڕوون نەکراوەتەوە! چونکە ئەگەر بە باشی بڕوانینە ئەو سەرچاوانەی کە ئەو دوو فەرموودەیەیان تێدا هێنراوە، دەبینین کە:

- لە لایەك تەعبیری (أحب الناس إلي) لە چەند فەرموودەیەکدا هاتووە، لە هەندێکیاندا بۆ ئەنصارەکان، وە لە هەندێکی تریان بۆ ئوسامەی کوڕی زەید، وە لە ئەم فەرموودانەشدا بۆ (ابو بکر، وعائشة، وفاطمة) (خوایان لێ ڕازی بێت)، بۆیە زانایان لە لێکدانەوە وڕوون کردنەوە وچۆنێتی تەوفیق خستنە نێوانیاندا وتەی خۆیان هەیە، کە هەموویان درووستن، وهەریەکەش لە کات وشوێن، وبەمەبەستی جیاجیا وتراون.
- لە لایەکی تریشەوە ئەو فەرموودانە لەوێدا تەواو نابن کە مامۆستا لەسەری ڕاوەستاوە، بەڵکو وەك لە زۆرێك لەو سەرچاوانەدا هاتووە، دەفەرموون: ئەو کەسەی کە پرسیارەکەی کرد، لە پاش وەڵامدانەوەکەی حەزرەت (درروودی خوای لەسەر بێت)، وتی: قوربان مەبەستم لە پیاوانە، واتە لە ناو پیاواندا کێت لە هەموو کەسێك خۆشتر دەوێت؟ ئەویش فەرمووی: باوکی عائیشە، واتە: ئیمامی ئەبو بەکری صدیق. بۆیە من پێم وایە ئەم دوو فەرموودەیە زۆر پەیوەندیان بە فەزڵ وپلە وپایەی ئافرەتەوە نییە، چونکە زۆر شتێکی سرووشتیە کە تەواوی یان زۆرینەی پیاوان، هاوسەر وکچی خۆیان لە هەموو ئافرەتێکی تر خۆشتر بوێت، بەڵکو لە واقیعیشدا هەر وایە. بە تایبەتی ئەوەی (فاطمة) (خوای لێ ڕازی بێت) لە هەندێك ڕیوایەتدا بەم جۆرە هاتووە: جئناك نسألك اي اهلك أحب إليك؟ قال: أحب أهلي إليّ فاطمة. الترمذي/ المناقب/ مناقب أسامة بن زيد/ ٣٨١٩، والطيالسي/ أحاديث أسامة بن زيد/ ٦٣٣، والطبراني في المعجم الكبير/ باب الألف/ اسامة بن زيد/ ٣٦٩.(وەرگێڕ)

بۆ فلانە ئافرەت، چونکە کاتی خۆی هاوڕێ ودۆست وخۆشەویستی (خدیجة) بووە.[1]

- لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: ((استوصوا بالنساء خیرا)).[2] واتە: بسپێرن کە نەوە لەدوای نەوە، دەست بە دەست بۆ ئافرەتان باش بن. کە ئاماژە دەکات بەوەی کە گرنگی بدرێت بە ئافرەتان بە گشتی، ژن وهاوسەر بن یان دایك یان کچ، یان هەر جۆرە پەیوەندییەکی خزمایەتی کە لە نێوان ژن وپیاودا هەبێت.
- ئەبو هورەیرە بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: پیاوی بڕوادار با ڕق وکینەی نەبێت بەرامبەر بە ژنی بڕوادار، چونکە ئەگەر هەڵسوکەوت ورەفتارێکیشی پێ ناخۆش بێت، ئەوا ڕەوشتێکی تری پێ پەسەندە وپێ خۆشە.[3]

بەڵکو نەك هەر ئەوەندە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێوەرێکی داناوە بۆ فەزڵ وپلە وپایەی پیاوان لە ناو خۆیاندا، ئەویش بەوەی کە: باشترین پیاو ئەو پیاوەیە کە لەگەڵ خێزان وماڵی خۆیدا باش بێت، بە تایبەتی هاوسەرەکەی، چونکە ئەو لە هەموویان زیاتر پێوەی بەستراوە ووابەستەیەتی، وەك دەفەرموێت:

---

(١) الحاكم في المستدرك/ كتاب معرفة الصحابة/ كتاب البر والصلة/ ٧٢٣٩، والبخاري في الأدب المفرد/ المعروف/ باب قول المعروف/ ٢٣٢، والطبراني في المعجم الكبير/ ذكر أزواج رسول الله صلى الله عليه وسلم منهن خديجة بنت خويلد/ مناقب خديجة/ ٢٠.

(٢) متفق عليه: البخاري/ كتاب النكاح/ باب الوصاة بالنساء/ ٤٨٩٠، ومسلم/ كتاب الرضاع/ باب الوصية بالنساء/ ١٤٦٨.

(٣) مسلم/ كتاب الرضاع/ باب الوصية بالنساء/ ١٤٦٩، وأحمد في مسنده/ ٨٣٤٥، وأبي يعلى في مسنده/ شهر بن حوشب عن أبي هريرة/ ٦٤١٨ و٦٤١٩، والبيهقي في السنن الكبرى/ كتاب القسم والنشوز/ باب حق المرأة على الرجل/ ١٤٥٠٤.

- باشترینی ئێوە ئەوەتانە کە لەگەڵ خێزانەکەی خۆیدا باشە، منیش لە هەمووتان زیاتر بۆ خێزانی خۆم باشم.[(١)]

هەروەها پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پیاوانی زۆر هانداوە لەسەر چاکە کردن لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا، بەوەی کە بە باشی خەرجیان بکێشن، وەك دەفەرموێت:

- دۆنمێك کە لە ڕێگەی خوادا خەرجی بکەیت، دۆنمێك کە بۆ ئازاد کردنی کۆیلەیەك خەرجی بکەیت، دۆنمێك کە بیدەیت بە خێر بە هەژارێك، دۆنمێك کە بۆ خەرجی خێزانەکەت خەرجی بکەیت، لە ناو ئەمانەدا لە هەموویان پاداشت زۆر تر ئەوەیانە کە بۆ خەرجی خێزانەکەت خەرجت کردووە.[(٢)]

لە بانگەشە ودەعوەتنامەیەکدا لە پێغەمبەرەوە بۆ تەواوی پیاوان سەبارەت بە چاکە کردن لەگەڵ خێزانەکانیان، لە ڕووی خەرجی کێشان وڕەفتار ومامەڵە لەگەڵ کردنیان، دەفەرموێت:

- هەرجۆرە خەرجیەك بکەیت ومەبەستت پێی ڕەزامەندی خوا بێت، ئەوا بە خێر بۆت دەنوسرێت، هەتاوەکو ئەو پاروو وتیکەیەش کە بەرزی دەکەیتەوە بۆ دەمی هاوسەرەکەت.[(٣)]

---

(١) الترمذي/ المناقب/ فضل أزواج النبي/ ٣٨٩٥، وابن ماجه/ كتاب النكاح/ باب حسن معاشرة النساء/ ١٩٧٧، وابن حبان/ كتاب النكاح/ باب معاشر الزوجين/ ٤١٧٧، والبيهقي في شعب الإيمان/ الخامس والسبعون من شعب الإيمان وهو باب في رحم الصغير وتوقير الكبير/ ١١٠١٤، وفي السنن الكبرى/ كتاب النفقات/ باب فضل النفقة على الأهل/ ١٥٤٧٧.

(٢) مسلم/ كتاب الزكاة/ باب فضل النفقة على العيال والمملوك وإثم من ضيعهم أو حبس نفقتهم/ ٩٩٥، والبيهقي في السنن الكبرى/ كتاب النفقات/ باب فضل النفقة على الأهل/ ١٥٤٧٥، والنسائي في السنن الكبرى/ كتاب عشرة النساء/ إيجاب نفقة المرأة وكسوتها/ الفضل في ذلك/ ٩١٨٣.

(٣) متفق عليه: البخاري/ كتاب النفقات/ باب فضل النفقة على الأهل/ ٥٠٣٩، ومسلم/ كتاب الوصية/ باب الوصية بالثلث/ ١٦٢٨.

ئەم شەریعەتە پیرۆزە هەر بەم دەقە پیرۆزانەشەوە نەوەستاوە کە ئەو یەکسا نییەی نێوان پیاو وئافرەتمان بۆ ڕوون دەکەنەوە، لە ڕووی ئەصڵی بەرپرسیارێتی وئەرك ومافەکانەوە، بەڵکو زیاد لەوەش فەرمانمان دەداتێ کە باش بین لەگەڵ ئافرەتاندا، چونکە بە شێوەیەکی گشتی لە پیاوان بێ هێز ترن، وزۆر ئەگەری ئەوەش هەیە کە پیاوان ستەمیان لێ بکەن وسنووری شەرع لە بارەیانەوە ببەزێنن، هەر بۆیە لەو ئایەت وفەرموودانەی کە باسمان کردن بینیمان کە چۆن وەسێت وئامۆژگاری پیاوان دەکەن، کە چۆن بە چاکی مامەڵە ورەفتار لەگەڵ ئافرەتاندا بکەن.

ئەو دەقانەی کە سەبارەت بە ڕێزگرتنی ئافرەتان، وپایە بەرزییان هاتوون دەکرێن بە دوو جۆرەوە:

<u>یەکەم</u>: ئەو دەقانەی کە پیاوان وئافرەتانی بە یەکسان داناوە لە ڕووی ئەصڵی بەرپرسیارێتی وماف وئەرکەکانەوە.

<u>دووەم</u>: ئەو دەقانەی کە وەسێت وڕاسپاردەیان تێدایە بۆ پیاوان کە باش مامەڵە لەگەڵ ئافرەتاندا بکەن.

جا ئەم جۆرەی دووەمیان بە پلەیەکی باڵاتر لەوەی یەکەمیان دەژمێررێت، چونکە جۆری یەکەم تەنها باس لە یەکسانی نێوانیان دەکات لە ئەصڵی بەرپرسیاریەتیدا، بەڵام جۆری دووەم وەسێتی تێدایە بۆ پیاوان کە پێویستە زۆر ڕەچاوی کەم هێزی ولاوازی وشەرم ونەرم ونیانی ئافرەتان بکەن.

پاك وبێ گەردی بۆ ئەو خوایەی کە خۆی زانا وکاربەجێ وبە سۆز و چاکەکارە لەگەڵ هەموو بوونەوەردا.

ئەوجا جۆری یەکەم بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە باس لەوە دەکات کە: ئافرەتانیش هەر وەکو پیاوان وەهان لە خودی بەرپرسیارێتی وئەرك و مافەکاندا، هەر جۆرە جیاوازییەکیش، کە وەها دەربکەوێت کە هەیە لە نێوان ئەرك ومافەکانی ئەم دوو ڕەگەزەدا، ئەوە تەنها دەگەڕێتەوە بۆ کار وپیشە

وتایبەتمەندێتی، ئەوەش ناگەیەنێت کە یەکێك لەو دوو ڕەگەزە لەوی تریان کەم تر وپایە نزم ترە.

بۆ نموونە ئەگەر باوکێك بەڵێن بدات بە منداڵەکانی کە بۆ ڕۆژی جەژن پۆشاکی تازەیان بۆ بکڕێت، ئەوکاتە ستەم وبە کەم تەماشا کردن لەوەدا دەردەکەوێت کە تەنها پۆشاك بۆ نێرینەکان بکڕێت، ومێیینەکان پشتگوێ بخات. بەڵام هیچ جۆرە ستەمێکی تێدا نییە کە لە جۆری جل وبەرگەکەدا جیاوازیان بکات، چونکە هەریەکەیان جۆرە پۆشاك وبەرگێکیان بۆ دەگونجێت، ئەویش بە پێی پێویستی منداڵەکان وجۆری ئەو مەبەستەی کە پۆشاکەکەی بۆ کڕاوە.

بەڵام ئەوەی کە جێگەی سەرسوڕمانە لێرەدا ئەوەیە کە: ئەم حاڵەتە ئەگەرچی بەلای هەموو کەسێکی زیر وتێگەیشتووەوە حاڵەتێکی زۆر سرووشتیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین کە کۆمەڵە کەسانێك دێن بە بێ بنەما گفتوگۆ ومشتومڕی لەسەر دەکەن، ودەڵێن: دەبێت هیچ جیاوازییەك نەکرێت لە نێوان نێرینە ومێیینەدا لە ڕووی پۆشینی جۆرەکانی جل وبەرگەوە، هەروەها لە ڕووی کردنی جۆرەها وەرزش ویاری کردنەوە، ئەگەر چی زۆر قورس وگرانیش بێت، وەك هەڵگرتنی شتە قورسەکان!!.

جا سوپاس بۆ خوای پەروەردگاری هەموو بوونەوەر، ئەو کۆمەڵە بانگەوازچیانە ئەوەندە بە ڕوونی بانگەشە دەکەن بۆ ئەو دادپەروەری ویەکسانییەی کە خۆیان دەیانەوێت، ومەبەستیشیانە کە ئێمەش وەك ئەوان وەها بین، ئەمەش وەهای کردووە، کە زۆرینەی ڕۆڵەکانی ئەم بەرنامە وڕۆشنبیری وشارستانێتیە خاوێنەی ئیسلام، بە باشی لێیان حاڵی بین، وشوێنیان نەکەون.

تەواوی ئەو دەقە قورئانیانە وسونەتەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە پێشتر باسمان کردن، بەرزی پێگەو پلەی ئافرەت لە شەریعەتی ئیسلامیدا دووپات دەکەنەوە ودەسەلێنن. هەروەها هیچ بەرنامەیەکی ئاسمانی وزەمینی

نە پێشتر ونە لە داهاتووشدا نییە، وناشبێت، کە بە وێنەی شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام ماف ورێزی بۆ ئافرەتان دانابێت، وبیانپارێزێت، وچاودێریان بکات.

وە سەرەڕای ئەو وێنە ئاشکرا ودیارەی ئافرەت کە لە دەقەکانی شەریعەتی ئیسلامیەوە دەردەکەوێت، چی لە ئایەتەکانی قورئان وچی لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کەسانێك بە دەستی ئەنقەست دێن کۆمەڵێك گومان وشوبهە وکۆنە رقی بۆماوەیی داب ونەریتی پێشینەکانیان دەهاونە سەر هەندێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، وەك هەوڵێك بۆ چەواشە کردن وگۆڕینی مەبەست وئامانجە بەرزەکانی ئەم شەریعەتە پیرۆزە.

یەکێك لەو فەرموودانەی کە زۆر گفتوگۆ ومشتومڕی لەسەر کراوە، ئەو فەرموودەیە کە سەبارەت بە ئافرەتان فەرموویەتی: (ناقصات عقل ودين) کە فەرموودەکە خۆی باس لە جوانی وتوانای کاریگەری کردن دەکات لەسەر هەست وبیر وعەقڵی پیاوان، وەك دەقی فەرموودەکە دەفەرموێت:

((ما رأيت من ناقصات عقل ودين أذهب للبّ الرجل الحازم من إحداكن). قلن وما نقصان ديننا وعقلنا يا رسول الله؟ قال: أليس شهادة المرأة مثل نصف شهادة الرجل؟ قلن: بلى. قال: فذلك من نقصان عقلها. أليس إذا حاضت لم تصل ولم تصم؟ قلن: بلى. قال: فذلك من نقصان دينها)).[1]

واتە: لە ناو نوقسانانی فام وئایندا، لە ئافرەتاندا نەبینیوە وەك یەکێك لە ئێوە، کە بتوانێت زاڵ بێت بەسەر عەقڵی پیاوێکی وریا وبە توانادا. ئەوانیش پرسیاریان کرد: باشە فام وئاین نوقسانی ئێمە لە چیدایە ئەی پێغەمبەری

(١) البخاري/ كتاب الحيض/ ترك الحائض الصوم/ ٢٩٨، ومسلم/ كتاب الإيمان/ باب بيان نقصان الإيمان بنقص الطاعات/ ٧٩، وأبو داود في السنن/ كتاب السنة/ باب الدليل على زيادة الإيمان ونقصانه/ ٤٦٧٩، والترمذي/ الإيمان/ استكمال الإيمان وزيادته ونقصانه/ ٢٦١٢، وابن ماجه/ كتاب الفتن/ باب فتنة النساء/ ٤٠٠٢، وأحمد في مسنده/ مسند المكثرين من الصحابة/ مسند عبد الله بن عمر بن الخطاب/ ٥٣٤٣.

خوا؟ ئەویش فەرمووی: ئایا وانییە کە شایەتی دانی ئافرەت بە نیوەی شایەتی دانی پیاوە؟ وتیان: بەڵێ وایە. ئەویش فەرمووی: دەی ئەوە نوقسانی فام وژیریانە. ئەوجا فەرمووی: ئایا وانییە ئەگەر ئافرەت کەوتە سووڕی مانگانەوە (حیض) نە نوێژ دەکات، ونە ڕۆژووش دەگرێت؟ وتیان: بەڵێ وایە. ئەویش فەرمووی: دەی ئەوەش نوقسانی ئاینەکەیەتی.

جا ئەم فەرموودەیە لە سەرەتاکەیدا سەرسوڕمانی تێدایە بە توانای هەندێك لە ئافرەتان، کە چۆن دەتوانن کار بکەنە سەر ژیرترین وبەهێزترین پیاو. بەڵام پاش ئەوەی کە یەکێك لە ئافرەتەکان وا تێگەیشت کە فەرموودەکە زیانی ئەوانی تێدایە وبۆ ئەوان خراپە، بۆیە پرسیاری کرد لە پێغەمبەر دەربارەی ئەو نوقسانی عەقڵ وئاینەی کە لە فەرموودەکەدا هاتبوو، پێغەمبەریش تێی گەیاند کە ئەو نوقسانییە ئەوە ناگەیەنێت کە پلەی ئافرەتان لە پلەی پیاوان نزم ترە، بەڵکو ئەوە دەگەیەنێت کە زۆر جار بە هۆی بێ هێزی بیر وهۆشی ئافرەتانەوە لە مەسەلەی شایەتی داندا پێویستی بەوە دەبێت کە کەسێکی تر بە بیری بهێنێتەوە. هەروەها ئەوە دەگەیەنێت کە بە هۆی هەندێك حاڵەتی فسیۆلۆجی وخیلقییەوە کە تایبەتە بە ڕەگەزی مێیینە، ئافرەتان لەو حاڵەتانەدا شەرع بڕیارەکانی لەسەر سووك وئاسان کردوون، چونکە ئەرکەکان لەو حاڵەتانەدا زۆر قورس وگرانن بۆیان، هەر بۆیە شەرع ڕێگەی پێداون کە لە حاڵەتی سووڕی مانگانەدا بۆ نموونە، ڕۆژوو ونوێژیان لەسەر نامێنێت، بەڵکو هەر قەدەغەشی کردوون لەسەریان.(١)

جا کاتێك کە ئەو ئافرەتە بە تەواوی تێگەیشت لە مانای فەرموودەکە سەبارەت بە نوقستانی عەقڵ وئاینیان، کە هیچ جۆرە سووکایەتی وکەم بایەخی وبێ ڕێزیەکی بۆ ئافرەتان تێدا نییە، ئیتر بێدەنگ بوو. ئەگینا چۆن

---

(١) بەڵام پێویستە دواتر ڕۆژوەکان بگێڕنەوە، بەپێچەوانەی نوێژەکان، کە گێڕانەوەیان ناوێت. (وەرگێڕ)

دەبێت هەموو ئافرەتان لە هەموو پیاوان لە ڕووی ئاینەوە نوقسان تر بن! ئەوەتا گەورەی ئافرەتانی جیهان: مەریەمی کچی عیمران، وفاتیمەی کچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، وخەدیجەی خێزانی، وئاسیەی ژنی فیرعەون (خوایان لێ ڕازی بێت)[1]، هەموو ئەمانە زۆرینەی پیاوان هەر لە تواناشیاندا نییە کە لە پلەی دینداری وخواپەرستی ئەوان نزیک ببنەوە، چی جای ئەوەی کە لەوان باشتر بن!!

کەواتە پێویستە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەکو خۆی وەر بگیرێت، وهەر بەو شێوەیەش لێك بدرێتەوە وڕاڤە بکرێت کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆی لێکی داوەتەوە، بە بێ زیاد وکەم. بۆیە دەکرێت بڵێین: بە هیچ شێوەیەك ئەم فەرموودەیە هیچ جۆرە زەم وناتەواوی دەرخستن ونەنگیەکی بۆ عەقڵی ئافرەتان تێدا نییە، بەڵکو تەنها باسی ئەو حاڵەتەی تێدایە کە زۆرێك لە ئافرەتان تێی دەکەون، ولەو حاڵەدا یەك دەگرنەوە، کە ئەویش لەبیر چوونەوەیە، بۆیە هیچ پێویست ناکات کە فەرموودەکەی پێغەمبەر لەم مانایە زیاتری بۆ بکەین وزیاد لەمە لێکدانەوەی تری بۆ بکەین.

---

(١) ئاماژەیە بەو فەرموودەیەی حەزرەت کە دەفەرموێت: سيدات نساء أهل الجنة أربع: مريم بنت عمران وفاطمة بنت رسول الله صلى الله عليه وسلم وخديجة بنت خويلد وآسية. الحاكم في المستدرك/ كتاب معرفة الصحابة/ ومنهم خديجة بنت خويلد/ ٤٨٥٣، والطبراني في المعجم الكبير/ باب العين/ أحاديث عبد الله بن عباس/ ١٢١٧٩.

# دەروازەی دووەم

# ئافرەتی موسوڵمان
# لە بەرهەم و نوسراوە فیقهیەکاندا

## کە دەسپێکێك وهەشت بەش لە خۆ دەگرێت:

- بەشی یەکەم : میراتی ئافرەت لە نێوان ڕاستیەکان ودرۆ هەڵواسراوەکاندا.
- بەشی دووەم : شایەتی دانی ئافرەتی موسوڵمان، وپەرچ دانەوەی گومانێك لە بارەیەوە.
- بەشی سێیەم : فرەژنی وحەقیقەتەکەی.
- بەشی چوارەم : مافی ئافرەت لە هەڵبژاردنی مێردی خۆیدا.
- بەشی پێنجەم : پێشنوێژی کردنی ئافرەت.
- بەشی شەشەم : خەتەنە کردنی مێیینەکان.
- بەشی حەوتەم : مافە سیاسیەکانی ئافرەت.
- بەشی هەشتەم: لێدانی ئافرەت لە ئیسلامدا.

## دەسپێك

ئەو مەسئەلانەی كە لە فیقهی ئیسلامیدا گرنگیان داوە بە ئافرەت و بڕیارەكانی گەلێك زۆرن، جا ئەگەر بمانەوێت هەمووی باس بكەین، ئەوا لێرەدا جێگەی نابێتەوە، بۆیە ئێمە زیاتر لەسەر كۆمەڵێك مەسەلەی تەواو گرنگ هەڵوێستە دەكەین، كە بە نموونەی پلە وپایە وپێگەی ئافرەت دادەنرێن لە سامان وبەرهەمەكانی فیقهی ئیسلامیدا، لەمەولا باسی ئەو مەسەلە گرنگانە دەكەین، كە بریتین لە:

بەشی یەكەم : میراتی ئافرەت لە نێوان ڕاستیەكان ودرۆ هەڵبەستراوەكاندا.

بەشی دووەم : شایەتی دانی ئافرەتی موسوڵمان وپەرچ دانەوەی گومانێك لە بارەیەوە.

بەشی سێیەم : فرەژنی وحەقیقەتەكەی.

بەشی چوارەم : مافی ئافرەت لە هەڵبژاردنی مێردی خۆیدا.

بەشی پێنجەم : پێشنوێژی كردنی ئافرەت.

بەشی شەشەم : خەتەنە كردنی مێیینەكان.

بەشی حەوتەم : مافە سیاسیەكانی ئافرەت.

بەشی هەشتەم : لێدانی ئافرەت لە ئیسلامدا.

# بەشی یەکەم

## میراتی ئافرەت لە نێوان ڕاستیەکان و درۆ هەڵبەستراوەکاندا

سەرەتا پێویستە بزانین میرات چییە؟ بزانین کە هەم لە زمانەوانی و هەم لە شەرعیشدا بە چی مانایەك هاتووە؟

وشەی (إرث) لە زمانەوانیدا بە چەند مانایەك هاتووە: بە مانای ئەصڵ، بە مانای شتێك هاتووە کە لە پێشینەکان دەمێنێتەوە بۆ پاشینەکان، بە مانای پاشماوەی هەموو شتێك، بە مانای گواستنەوەی شتێك لە کەسێك یان کۆمەڵێك بۆ کەس وکۆمەڵێکی تر، بە مانای ئەو ماڵ ومافانەی کە لە پاش کەسێك بەجێ دەمێنێت کە ئەمەیان زیاتر لە مانای (**ترکة**)[1] نزیك ترە.

بەڵام وەك زاراوەیەکی فیقهی ئیسلامی، لای زانایانی شەرع: شافیعیەکان و(**قاضي افضل الدين الخونجي**) لە حەنبەلیەکان، بریتیە لە: مافێك کە گونجاوە بۆ دابەش کردن، ولە پاش مردنی خاوەنەکەی دەبێتە ماڵ وموڵکی کەسێکی تر بە پێی شەرع، بە هۆی بوونی خزمایەتی یان هۆیەکی ترەوە لە نێوان ئەم ومردوەکەدا.

جا یەکێك لەو شتە گرنگانەی کە پێویستە هەموو موسوڵمانێکی هۆشیار هەمیشە ئاگای لێی بێت، ئەوەیە کە بواری ئیجتیهاد کردن لە زانستی میراتدا، بە تایبەتی، زۆر تەسکە. ئەو بڕیارانەش کە سەبارەت بەم زانستە هاتوون بە زۆری جێبەجی کردنی دەقە قورئا نییەکانن. کەواتە خوای گەورە بە

(١) (ترکة) بریتیە لەو ماڵ وسەروەت وسامانەی کە لە مردوویەك بەجێ دەمێنێت بۆ میراتبەرەکانی. (وەرگێڕ)

حیکمەتی خۆی بەشی هەر میرات بەرێکی دیاری کردووە. بۆیە کاتێك کە زانایان بەوردی سەیری ڕاستیەکانی ئەم زانستە وبەشی هەر میرات بەرێکیان کرد، ئەوکاتە زیاتر دڵیان متمانە وئارامی بۆ هات، ودڵنیا بوون لە کاربەجێیی خوای گەورە، کە ئەم شەریعەتە بەرز وپیرۆزەی ناردوە، وئەو کاتە بە تەواوی یەقینەوە وتیان: خوای گەورە ڕاستی فەرمووە، کە دەفەرموێت: ﴿مَّافَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍ﴾ الأنعام/٣٨. ((واتە: هیچ شتێکمان بەجێ نەهێشتووە، وهەموویمان تۆمار کردووە)).

ئەوجا وەك ڕەخنەگرتن، زۆر جار کەسانێك ئەم وتەیە دەستەواژەیە دەکەنەوە: ((ئاینی ئیسلام ستەمی لە ئافرەت کردووە، چونکە لە بەشە میرات دا نیوەی بەشی پیاوی پێداوە))

ئێمەش وەکو موسوڵمان بڕوای تەواو وجێگیرمان بەوە هەیە کە خوای گەورە کۆمەڵێك سیفەتی بەرزی هەیە، ئەوەمان تێدەگەیەنێت کە هەرگیز نابێت هیچ جۆرە گومانێکی لەم جۆرە بەم بەرنامە پیرۆزە خواییە ببرێت، یەکێك لەو سیفەتانە ئەوەیە کە خوای گەورە زۆر دادوەرە لە بڕیارداندا و، ئەو بەرنامانەی کە بۆ ئێمەی ئادەمیزادی ناردووە هیچ جۆرە ستەمێکی بەرامبەر هیچ کەسێك، وبەڵکو بەرامبەر هیچ بوونەوەرێکیشی تێدا نییە، ئەم ڕاستیەش لە چەند ئایەتدا دووپات کراوەتەوە، وەك:

﴿وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾ الكهف/٤٩. ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا﴾ النساء/٤٩. ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ الحج/١٠. ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ﴾ العنكبوت/٤٠. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ﴾ النساء/٤٠. ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا﴾ النساء/١٢٤. ﴿فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ﴾ التوبة/٧٠.

ئەو جیاوازیانەش کە لە بەشی میرات بەرەکاندا هەیە، لە میرات بەرێکەوە بۆ میرات بەرێکی تر، ولە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر، پەیوەندی بە جۆری

میرات بەرەکەوە نییە، کە ئایا مێیینەیە یان نێرینە، بەڵکو سەرچاوەی جیاوازیەکە لەم سێ پێوەرەدا خۆی دەبینێتەوە:

١. **پلەی خزمایەتی نێوان میرات بەر ومردووەکە،** ئیتر میرات بەرەکە نێرینە بێت یان مێیینە، بە جۆرێك کە چەندە پەیوەندی خزمایەتیەکە نزیك تر بێت، ئەوەندە بەشی ئەو میرات بەرە لە میراتەکە زیاد دەبێت، بە پێچەوانەشەوە، چەندە پەیوەندیەکە دوورتر بێت، ئەوەندە بەشە میراتەکەش کەم دەبێت، ئیتر بێ گوێدانە ڕەگەزی میرات بەرەکە، کە نێرینەیە یان مێیینە. وەك دەبینیت: کچێك (لەگەڵ ئەوەشدا کە مێیینەیە) نیوەی میراتەکەی دایکی دەبات، کەچی باوکی ئەو کچە (کە نێرینەیە) کە دەکاتە مێردی ژنە مردوەکە، چواریەکی میراتەکە دەبات. هۆی ئەم جیاوازیەش دەگەڕێتەوە بۆ پلەی خزمایەتی نێوان کچ ودایکەکەی، کە نزیك ترە لە پلەی خزمایەتی نێوان مێرد وژنەکە، بۆیە بەشە میراتی کچەکە لە بەشە میراتی مێردەکە زیاترە.

٢. **جێگە وپێگەی میرات بەرەکە،** کە بێ گومان هەر نەوە ووەچەیەك کە سەرەتای بەرەو ژیان چوونی بێت، وزیاتر ئامادەبێت کە ڕووبەڕووی ناڕەحەتیەکانی ژیان ببێتەوە، ئەو کەسە دەبێت بەشە میراتی لەو نەوە ومیرات بەرانەی تر زیاتربێت کە پشتیان کردووەتە ژیان، وتەمەنیان بەرەو کۆتایی دەچێت، وقورسایەکانی ژیانیان لەسەر سووك دەبێت، بەڵکو نەك هەر سوك دەبێت، بگرە ناڕەحەتیەکانیان دەکەوێتە سەر شانی کەسانێکی تر، ئەم پێوەرەش هیچ ڕەچاوێکی ڕەگەزی میرات بەرەکانی تێدا نییە. بۆ نمونە: بەشە میراتی کچی مردوویەك زیاترە لە بەشە میراتی دایکی ئەو مردووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەردووکیان مێیینەن. هەروەها کچی ئەو مردووە لە باوکی مردوەکە میرات زیاتر دەبات، کاتێك

کە کچەکە برایەکی خۆی لەگەڵدا بێت.[1]

٣. **ئەرك وقورسایی ماڵی ودارایی**، ئەمەیان تەنها پێوەرە کە جیاوازی نێوان بەشە میراتی نێرینە ومێیینەی لێ دەکەوێتەوە. بەڵام جیاوازیەکە هەرگیز بەو جۆرە نییە کە هیچ جۆرە ستەمێکی بۆ مێیینە تێدا بێت، یان ببێت بە هۆی خواردن وپێشێل کردنی مافەکانی، بەڵکو پێی دەچێت کە پێچەوانەکەی ڕاستتر بێت (ئەگەر بە وردی تێی بڕوانین).

کەواتە ئەگەر دوو میرات بەر لە هەردوو پێوەرەکەی پێشوودا (پلەی خزمایەتی، وپێگەی میرات بەر) وەکو یەك بوون، وەك: منداڵی مردوەکە، نێرینە ومێیینە پێکەوە، ئەوکاتە دەبێت ئەم پێوەرەی سێ یەم ڕەچاو بکرێت بۆ جیاوازی بەشە میراتی نێرینە ومێیینە لە یەکتر. هەر بۆیە قورئانی پیرۆزیش ئەو جیاوازییەی گشتگیر نەکردووە بۆ هەموو میرات بەران [2]، بەڵکو تایبەتی کردووە بە چەند حاڵەتێکەوە.

---

(١) چونکە باوکی مردوەکە شەش یەك دەبات کاتێك کە مردوەکە کوڕی هەبێت، ئەوجا ئەو پێنج بەشەش کە دەمێنێتەوە کوڕ وکچەکە دەیبەن بەپێی ڕێسای: ((لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ)). (وەرگێڕ)

(٢) بە جۆرێك کە ئایەتی: ((لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ)) وەك ڕێسایەکی گشتی دابنرێت کە هەموو کات لە کاتی کۆبوونەوەی نێرینە ومێیینەدا جێبەجێی بکرێت، وەکو چۆن ڕەخنەگران لێکی دەدەنەوە، بەڵکو ئەم ڕێسایە تەنها بۆ حاڵەتێکی تایبەتە کە خوای گەورە لە سەرەتای ئایەتەکەوە باسی لێوە دەکات وەك دەفەرموێت: ((يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ)) النساء/١١. واتە حاڵەتی کۆبوونەوەی منداڵ بەیەکەوە، کاتێك کە نێرینە ومێیینەی منداڵەکان بەیەکەوە کۆبوونەوە، ئەوا نێرینەکان مێیینەکان دەکەن بە عەصەبە، ئەوجا یان هەموو میراتەکە دەبەن پێکەوە، یان پاشماوەی خاوەن بەشە دیاریکراوەکان دەبەن پێکەوە، بەجۆرێك کە هەر نێرینەیەك دوو بەرامبەری مێیینەیەك میرات دەبات، هەروەها ئەم ڕێسایە جێبەجێ دەکرێت کاتێك کە برا وخوشکی باوك ودایکی، یان تەنها باوکیش بەیەکەوە کۆببنەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَإِن كَانُوٓاْ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ)) النساء/ ١٧٦. (وەرگێڕ)

کەواتە حیکمەت لەم جیاوازییەدا بە تایبەتی لەم حاڵەتەدا ئەوەیە کە نێرینە پێویستە لەسەری وئەرکی سەرشانی خۆیەتی کە بژێوی ژیانی خێزان ومنداڵەکانیش دەستەبەر وپەیدا بکات، لە کاتێکدا کە مێیینە ژیان وبژێوی خۆی ومنداڵەکانیشی دەکەوێتە ئەستۆی ئەو نێرینەیەی کە لەگەڵیدا دەژی.

بەمەش ئەگەر چی ئەم مێیینە لەم حاڵەتەدا بە ڕواڵەت وەها دەردەکەوێت کە بەشە میراتەکەی کەم ترە لە بەشە میراتی نێرینەکە، بەڵام ئەگەر بە وردی بۆی بڕوانین دەبینین: کە ئەو بەشە میراتەی کە بۆ ئەم مێیینەیە دانراوە زۆر زیاتر وباشترە، چونکە ئەو بەشە میراتە بە مافێکی سەربەخۆ دادەنرێت بۆی، ودەتوانێت پاشەکەوتی بکات، بۆ جێگە کرتنەوەی ئەو بێ هێزی وکەم توانایییەی کە هەیەتی، وژیانی خۆیی پێ ئاسوودە ومسۆگەر بکات لەو مەترسی وگۆڕانکاریانەی کە دێنە ڕێگەی، کە ئەمەش یەکێکە لە حیکمەتەکانی خودا، کە شاراوە وهەست پێ نەکراوە لە لایەن زۆرێك لە خەڵکانەوە.

ئەوجا لە ئەرکە ماڵی ودارایییەکانی نێرینە ئەمانەیان باس دەکەین:

١. نێرینە هەر لەسەرەتای پێکهێنانی خێزان ودەست پێکردنی ژیانی هاوسەری پێویستە لەسەری کە مارەیی بدات بە هاوسەرەکەی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةً ﴾ النساء/٤. ئەم مارەییەش بریتیە لە ئەرکێکی ماڵی ودارایی کە ژنخواز دەیدات بە ئافرەتەکە لە سەرەتای پێکەوەنانی ژیانی هاوسەریدا، جا ئەم مارەییەش تەنها دەکەوێتە ئەستۆی نێرینە، وئەم بۆی نییە کە داوای مارەیی بکات لەو ئافرەتەی کە داخوازی کردووە.

٢. پیاو لەپاش ژن مارەبڕین، ئەرکی خەرجی کێشانی ئەو ژنەی دەکەوێتە ئەستۆ، ئەگەرچی ژنەکە لە پیاوەکەش دەوڵەمەند تربێت ومال ومولکی زیاتر بێت. کەواتە پیاو بۆی نییە داوای ئەوە بکات کە باوەکو ژنەکەی خەرجی لەسەر خۆی بێت، چی جای ئەوەی داوای ئەوە بکات کە ژنەکە

خەرجی ئەم بکێشێت، چونکە ئاینی ئیسلام ئەم تایبەتمەندیەی داوە بە ئافرەت و نەیداوە بە پیاو، ماڵ وموڵکی ئەو ئافرەتە دەپارێزێت، و پێویستی نەکردووە لەسەری کە خەرجی لێ بکات بۆ کەس.

٢. پیاو وەك چۆن ئەرکی خەرجی کێشانی خێزانەکەی لە ئەستۆدایە، هەروا ئەرکی بەخێوکردن وخەرجی کێشانی خزمەکانی خۆشی زۆر جار دەکەوێتە ئەستۆ، چونکە هەر ئەو هەڵدەسێت بە ڕاپەڕاندنی ئەو ئەرکە خێزانی وکۆمەڵایەتیانەی کە بەر لە ئەم کەسێکی تر پێیان هەڵدەسا، بەو پێیەی کە ئەمیش یان بەشێکە لە ئەو، یان درێژبوونەوەی ئەوە، یان عەصەبەیەتی.

ئەم هۆیانە وچەند هۆیەکی تریش وەهامان لێ دەکەن کە ئێمە بە شێوەیەکی بابەتیانە بڕوانینە ماڵ وسامان. ئەویش ئەوەیە کە ماڵ وموڵك وسامان ماناکەیان زۆر لە مانای دەسهات فراوان ترە، چونکە دەسهات بەو ماڵە دەوترێت کە زیاد دەبێتە سەر سامانی کەسێك، نەوەك خودی سامانەکە، بەڵام سامانەکە هەموو ئەو ماڵ وموڵکانە دەگرێتەوە کە هەم دێنە دەستی کەسێك وهەم لە دەستیشیدا دەمێننەوە. ((ڕاستە، لەو حاڵەتەی کە باسمان کرد مێیینە نیوەی نێرینە میرات دەبات، بەڵام بزانین ئایا ئەو بەشە زۆرەی کە بە نێرینەکە دراوە بەرەو کوێ دەچێت؟ وچی بەسەردێت؟ بە هەمان شێوە بەشە کەمەکەی مێیینەکەش چی بەسەردێت؟)).

بەو شێوەیەی کە باسمان کرد، ئاینی ئیسلام لەو دەسهاتە نیوەی بەشی نێرینەیەکی داوە بە مێیینەیەك، بەڵام ئەو مافەی داوە بە مێیینە کە بەشە میراتی خۆی پاشەکەوت بکات، وهیچی لێ خەرج نەکات، تەنها زەکات دەرکردن نەبێت ((کە ئەویش پەیوەندی بە ماڵەوە هەیە نەك بە خاوەنەکەی))، بەڵام نێرینە کە خوای گەورە دەسهاتە زۆرەکەی پێداوە، لە هەمان کاتدا ئەرکی خەرجی خێزان ومنداڵەکانی، ودایك وباوکی کە تەمەنیان چوەتە سەرەوە، خەرجی خزم وکەس وکار، وخزمەتکار، وهەموو ئەو پێداویستیە نوێیانەی

ئەمڕۆ، وەك: کرێ خانوو، وپارەی کارەبا، وئاو، وتەلەفوون، وپێویستیەکانی تریشی خستوەتە سەر. ئەمەش بڕوای تەواومان بۆ دروست دەکات کە ((ئەگەر ئاوا دوور بڕوانین دەزانین کە)) خوای گەورە فەزڵی مێیینەکەی داوە بەسەر نێرینەکەدا، چونکە هەم ماڵەکەی بۆ دەپارێزێت، وهەم هیچ جۆرە خەرجیەکیشی لێ داوا نەکردووە.[1]

---

(١) هەروەها مێیینە لە هەر جێگەیەکدا بژی ئەوا نێرینەیەك دەبێت کە خەرجی بکێشێت، وخزمەتی بکات، ولێی بەرپرسیار بێت. وەك دەبینین، تاوەکو لە ماڵی باوکیدایە، باوکی خزمەتی دەکات. جا ئەگەر باوکی نەمابێت، ئەوا براکەی یان مامی یان کوڕەمامی بەم ئەرکە هەڵدەسێت، وە ئەگەر شووی کرد، ئەوا مێردەکەی لێی بەرپرسیارە کە مارەیی بداتێ، وخەرجی بۆ بکات، وخانووی بۆ دابین بکات، وهەموو پێویستیەکانی ژیانی بۆ فەراهەم بکات، باوەکو ژنەکەش خۆی دەوڵەمەند تر بێت! بەمەش ئەو مێیینە لەلایەك میراتی وەرگرتوە وخەرجی ناکات، وە لەلایەکی تریشەوە مارەییان پێداوە، کە بێجگە لەوەی کە دەتوانێت پاشەکەوتی بکات، دەشتوانێت بیخاتە پرۆژەیەك کە قازانج وسوودی زیاتری لێ بکەوێتەوە.

کەواتە دەکرێت بڵێین: لەوەدا کە ئیسلام ئەو نیوەیەی بۆ مێیینە داناوە جۆرە فەزڵێکی تێدایە بەسەر نێرینەدا، بەڵام لە هەمان کاتدا دەبێت ئەوەش بزانین کە ئەم مێیینەیە پێویستی بەم بەشە میراتە هەیە، بەهۆی ئەوەی کە بە شێوەیەکی گشتی لە نێرینە بێ هێز ترە، هەروەها ماندووبوون وئەرکی سك پڕی ودایکایەتی وپەروەردەکردنی منداڵ وچەند ئەرکێکی تر وەها دەکەن کە ئەم مێیینە توانای کارکردن ودەست خستنی پارەی نەبێت، بەو جۆرەی کە نێرینە توانای هەیە، هەروەها دەکرێت بڵێین: لەوەشدا کە ئەرکێکی زۆر کەوتوەتە سەر شانی نێرینە، هیچ جۆرە ستەمێکی تێدا نییە دەرهەق بەو نێرینەیە، وە ناشڵێین کە ئیسلام فەزڵی مێیینەی داوە بەسەر نێرینەدا.

وە ئەو بەشە میراتەش کە دانراوە بۆ مێیینە، ئیسلام ڕەچاوی ئەوەی کردووە کە ئەگەر مێیینەیەك، باوکی نەمابوو، وە برا ومام وکوڕە مامیشی نەبوو، وە شووشی نەکردبوو، کە ئەم حاڵەتەش زۆر کەمە، لەم کاتەدا کە کەسێك نییە خەرجی بکێشێت، ئەم ماڵەی دەدرێتی وەك ماڵێکی پاشەکەوت، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو جۆرە حاڵەتانە.

پێم باشە کە نمونەیەك بێنینەوە تاوەکو زیاتر مەسەلەکەمان لەلا ڕوون ببێتەوە:

پیاوێك مردوە: شەش هەزار (٦٠٠٠) دۆنمی لەپاش بەجێ ماوە، وتەنها کوڕێك، وکچێکیشی هەیە.

لەم مەسەلەیەدا کوڕەکە چوار هەزار (٤٠٠٠) دۆنمی پێدەدرێت، وکچەکەش دوو هەزار (٢٠٠٠)، جا وەك وتمان: خراپترین حاڵەتی کچەکە ئەوەیە کە تەنها خەرجی -

هەر بۆیە کاتێك کە مەسەلەی بژێوی وناڕەحەتیەکانی ژیان لە ئارادا نەبێت، وەك باسی میراتی برا وخوشکە دایکیەکان، ئەوا دەبینین کە خوای کاربەجێ جیاوازی نەکردووە لە نێوان بەشە میراتی نێرینە ومێیینەدا، وەك دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ﴾ النساء/ ١٢. ((واتە: ئەگەر پیاوێك یان ژنێك مرد و(کەلالە) بوو، واتە: نە باوکی هەبوو نە منداڵ، بەڵام برایەك یان خوشکێکی تەنها دایکی هەبوو، ئەوە هەر یەکێك لەوانە شەش یەکی میراتەکە دەبات، بەڵام ئەگەر زیاتر بوون ـ دوو برا یان دوو خوشك ـ ئەوا بە هەموویانەوە سێ یەکی میراتەکە دەبەن، بەبێ جیاوازی لە نێوان نێرینە ومێیینەدا)).

کەواتە لێرەدا جیاوازی لە نێوان نێرینە ومێیینەدا نییە، چونکە سەرچاوەی میرات بردنەکەیان بریتیە لە خزمایەتی سك (الرحم)، وکەسیشیان لە خزمەکانی پشت (عصبة) نین، تاوەکو بڵێین نێرینەکە درێژەپێدەری ئەو خزمایەتی پشتەیە، ومێیینەکە درێژەپێدەری نییە. کەوابوو هیچ بەرپرسیارێتیەك وقورساییەك ناکەوێتە سەر نێرینەکە ((هەر بۆیە دەبێت جیاوازی نەکرێت لە نێوانیاندا)).

---

= خۆی بکێشێت و بەس، کە لەم کاتەدا دوو هەزارەکە پارەیەکی باشە بۆ ئەم مەبەستە، وە لە کاتێکدا کە شوو دەکات، ئەو کاتە خەرجیەکەی دەکەوێتە ئەستۆی مێردەکەی، ودەتوانێت کە هەموو دوو هەزارەکە بۆ خۆی پاشەکەوت بکات، بەڵام کوڕەکە کە چوار هەزاری بردوە، دەبێت ژن بهێنێت، ومارەییشی بدات، وخەرجیشی بکێشێت، کەواتە ئەو چوار هەزارە تەنها بۆ کوڕەکە نەبوو، بەڵکو بۆ دوو کەس بوو، کە خۆی وژنەکەیەتی.
جا ئێستا ئەگەر بپرسین، ئایا کامیان زۆرتریان بردوە؟ بێ گومان کەسی ژیر دەڵێت: مێیینەکە، چونکە بەشە میراتەکەی تەنها بۆ خۆیەتی وبەس، وبەرپرس نییە لە بژێوی هیچ کەسێکی تر. (وەرگێڕ)

ئـەوجا بـە گـەڕان وپشـكنین وبەدواداچـوونی حاڵـەت ومەسـەلەكانی میراتدا چەند ڕاستیەك بۆ هەندێك لـە زانایـان وتوێـژەرەوەكان دەركـەوتوە كـە كەسانێكی زۆر سەرسام دەكەن، ئەوەی كە بۆیان دەركەوتوە بریتیە لەمـەی كـە دێت:

یەكـەم : تـەنها چـوار حاڵـەت هەیـە كـە مێیینـە نیـوەی نێرینـە مـیرات دەبات.

دووەم : چەنـد بەرامبەری ئەو حاڵەتانە مێیینە بـە هاووێنـەی نێرینـە میرات دەبات.

سێیەم : چەنـد حاڵەتێكی زۆر هەن كە مێیینە لـە نێرینـە زیـاتر مـیرات دەبات.

چوارەم : هەنـدێك حاڵـەت هەن كە مێیینە میرات دەبات، بـەڵام نێرینـەی هاووێنەی میرات نابات.

جا بە درێژی حاڵەتەكان بەم شێوەیەن:

# ئەو حاڵەتانەی كە مێیینە نیوەی نێرینە میرات دەبات

١. كچ لەگەڵ برای خۆیدا (واتە: لەگەڵ كوڕدا كۆ ببێتەوە). كچی كوڕ لەگـەڵ كوڕی كوڕدا كۆببێتەوە.[(١)]
٢. دایك لە گەڵ باوك دا لە مەسئەلەیەكدا كـە نـە منداڵی تێدابێت، ونـە ژن

(١) خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ﴾، وە منداڵی كوڕیش هەر هەمان حوكمی منداڵی هەیە بە یەكدەنگی زانایان. (وەرگێڕ)

یان مێرد.[١]

---

(١) ئەم خاڵەیان پێویستی هەم بە ڕاست کردنەوە، وهەم بە ڕوون کردنـەوەش هەیـە، بۆیـە دەڵێین:

دایك کاتێك نیوەی میراتی باوك دەبات کە:

❖ خۆیان بـە تـەنها بـن. (واتـە: مردوەکـە تـەنها ئـەوانی لـەپاش بـەجێ مابێـت، یـان کەسانێکی تری لە پاش بەجێ مابێت، بەڵام بەهۆی باوکەکەوە لە میرات بێ بـەش بـبن، کە ئەمەشیان هەر وەکو ئەوە وەهایە کە خۆیان بە تـەنها بـن). لـەم حاڵەتـەدا دایکەکـە سێ یەك دەبات، وباوکەکەش ئەو دووسێ یەکەکە دەبات بە عەصەبەگەرایەتی.

❖ کۆ ببنـەوە لەگـەڵ مێـرد یـان ژن. ئـیتر کەسـی تریـان لەگەڵدا نـەبێت، کـە ئـەم مەسـئەلەیە زانایـان ناویـان لێ نـاوە: دوو مەسـەلە پرشـنگدارەکە (الغـراوین)، یـان دوو مەسەلەکەی عومەر (العمريتين).

جـا زانایـان کۆدەنگن لـەوەدا کـە هـەر کاتێـك دایـك لەگـەڵ بـاوك، وژن یـان مێـرد دا کـۆ ببێتەوە، ئەوا: سێ یەکی پاشماوەی بەشی ژنەکە یـان مێردەکـە دەبـات (ثلث البـاقي)، نـەك سێ یەکی هەموو میراتەکە.

دوو مەسەلەکەش ئەمانەن:

١) ئەگـەر ژنێـك بمرێـت: دایـك، بـاوك، مێـردی لـەپاش بـەجێ بمێنێـت، ئـەوا مەسەلەکەیان لە دووە (٢). نیوەی کە بریتیە لە یەك (١) مێردەکەی دەیبات، ویەکیشی دەمێنێتەوە، دایکەکەش سێ یەکی ئەم یەکە دەبات، بەڵام لەبەر ئەوە کە ژمارە یـەك(١) بەشی دروست وساغی نییـە، بۆیـە دەبێت ئەصڵی مەسـەلەکە لێکدانی سێ (٣) بکـەین تاوەکو ساغ ببێتەوە، بەمەش ئەصڵی مەسەلەکە دەبێت بـە: شـەش (٦)، جا ئێستا ئـەم شەشە، نیوەی بۆ مێردەکە کە دەکاتە: سێ (٣)، وە سێ یـەکی ئەوەشـی کـە دەمێنێتـەوە بۆ دایکەکە، کە دەکاتە: یەك (١)، بەمەش دوو بەش دەمێنێتەوە بۆ باوکەکە.

(٢)

| ئەصڵی مەسەلە | | ٢ ← ٣ × | ٦ | ٦ |
|---|---|---|---|---|
| مێرد | نیوە | ١ | ٣ | ٣ |
| پاش ماوە | | ١ | ٣ | ٠ |
| دایك | | (؟) | سێ یەکی پاشماوە | ١ |
| باوك | | (؟) | عەصەبە | ٢ |

ئەگەر پیاوێك بمرێت: دایك، باوك، ژنێکی لەپاش بەجێ بمێنێت، ئەوا مەسـەلەکەیان لـە چوارە (٤)، چوار یـەکی کـە دەکاتـە: یـەك (١) ژنەکـە دەیبـات، دوانـی (٢) بـۆ باوکەکەیـە، ویەکێکی (١) بۆ دایکەکەیە.

٣. خوشکی دایك وباوکی لەگەڵ برای دایك وباوکیدا.
٤. خوشکی تەنها باوکی لەگەڵ برای تەنها باوکیدا.[١]

- ..........

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسەلە | | ٤ | ٤ |
| یەك ژن | چواریەك | ١ | ١ |
| پاش ماوە | | ٣ | ٠ |
| دایك | | سێ یەکی پاشماوە | ١ |
| باوك | | عەصەبە | ٢ |

لەم دوو مەسەلەدا بۆیە دایك سێ یەك نابات – لەگەڵ ئەوەشدا کە دەبوو سێ یەکی بکەوێت – چونکە ڕێسایەکی گشتی پڕ لە حیکمەت لە (فرائض) دا هەیە کە دەڵێت: هەموو مێیینەیەك نیوەی ئەو نێرینەیە میرات دەبات کە لە هەمان پلەی خۆیدایەتی. جا ئەگەر دایکەکە سێ یەك ببات، وباوکەکەش سێ یەکی بردبێت، ئەوا بەشەکانیان یەکسان دەبن، وئەمەش پێچەوانەی ئەو ڕێسایەی سەرەوەیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیبنو عەباس خۆی بە تەنها فەتوای داوە وفەرموویەتی: سێ یەکی دەکەوێت، نەك سێ یەکی پاشماوە (وەرگێڕ)

(١) خوای گەورە سەبارەت بە هەردوو حاڵەتی سێیەم وچوارەم دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۗ﴾ النساء/ ١٧٦.

حاڵەتێکی تر هەیە کە هەندێك لە زانایان ئاماژەیان پێداوە، کە تێیدا نێرینە دوو بەرامبەری مێیینە میرات دەبات، ئەویش حاڵەتی مێرد وژن. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَكُمۡ نِصۡفُ مَا تَرَكَ أَزۡوَٰجُكُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٞۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٞ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡنَۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِينَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖۚ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡتُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّكُمۡ وَلَدٞۚ فَإِن كَانَ لَكُمۡ وَلَدٞ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكۡتُمۚ مِّنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ تُوصُونَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖۗ﴾ النساء/ ١٢. بەڵام ئەم حاڵەتە بەر ئەم باسەی ئێمە ناکەوێت، چوونکە ئێمە لێرەدا باسی کۆبوونەوەی نێرینە ومێیینە دەکەین. بەڵام لێرەدا نێرینە ومێیینەکە بەیەکەوە کۆ نابنەوە، چونکە ئەگەر ژنەکە بمرێت ئەوا مێردەکەی ماوە، وە ئەگەر مێردەکەش بمرێت ئەوا ژنەکەی ماوە، وهەرگیز ناگونجێت کە بە سیفەتی ژن ومێردایەتی بەیەکەوە کۆ ببنەوە. بەڵام لە هەمان کاتدا ئەو زانایانە پێیان وایە کە هۆی ئەو جیاوازیە لە میراتی ژن ومێرددا لە هەردوو حاڵەتەکەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەمانە نێرینە ومێیینەن ولە یەك پلەشدان، بۆیە دەبێت نێرینەکە دوو بەرامبەری مێیینەکە میرات ببات. (وەرگێڕ)

# ئەو حاڵەتانەی کە مێینە ونێرینە یەکسانن لە میرات بردندا

١. دایك وباوك، کاتێك کە کوڕی کوڕیان لەگەڵدا بێت.[١]
٢. برا وخوشکی تەنها دایکی.[٢]
٣. چەند خوشکێك کە لەگەڵ چەند برا وخوشکێکی دایکیدا کۆببنەوە.[٣]
٤. کچ کاتێك کە لەگەڵ مامی خۆیدا، یان لەگەڵ نزیك ترین عەصەبەکانی باوکیدا کۆ ببێتەوە. وکەسێکیش نەبێت کە مامەکە بێ بەش بکات.[٤]
٥. دایکی دایك لەگەڵ باوك، وکوڕی کوڕدا.[٥]

---

(١) هەروەها ئەگەر کوڕیشیان لەگەڵدا بێت، لەم کاتەدا هەریەکە لە دایك وباوکەکە شەش یەك دەبەن، وپاشماوەکەش بۆ کوڕ یان کوڕی کوڕەکە دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٞۚ﴾ النساء/١١. (وەرگێڕ)

(٢) ئەگەر کەسێك نەبێت لە میرات بێبەشیان بکات، هەریەکەیان شەش یەکی میراتەکە دەبەن، بە مەرجێك کە بە تەنها بن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿.....وَإِن كَانَ رَجُلٞ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمۡرَأَةٞ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوۡ أُخۡتٞ فَلِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُۚ﴾ النساء/١٢. هەروەها ئەگەر ژمارەشیان دوو بێت یان زیاتر، وهەر تەنها خوشکەکان بن، یان تەنها براکان، یان پێکەوەبن، ئەوا سێ یەکی میراتەکە دەبەن، بەبێ جیاوازی نێوان نێرینە ومێینە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿... فَإِن كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمۡ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِۚ﴾ النساء/١٢. (وەرگێڕ)

(٣) پێم وایە ئەم حاڵەتە هەر دووبارە بوونەوەی بەشی دووەمی خاڵی دووەمە، کە باسمان کرد، ئەگینا ئەو دەقەی کە لە ئەصڵەکەدا هاتووە هەڵەیە، کە دەڵێت: (أخوات مع الإخوة والأخوات لأم). (وەرگێڕ)

(٤) چونکە لەم کاتەدا کچەکە نیوە دەبات وەك خاوەن بەشی دیاریکراو، ومامەکەش (یان هەر عەصەبەیەکی تر، یەك بێت یان زیاتر) نیوەکەی تر دەبات بە عەصەبەگەرایەتی. (وەرگێڕ)

(٥) چونکە لەم کاتەدا دایکی دایك شەش یەك دەبات، وباوکەکەش شەش یەك دەبات، وپاشماوەکەش کوڕی کوڕەکە دەیبات بە عەصەبەگەرایەتی. (وەرگێڕ)

٦. مێرد ودایك ودوو خوشكی دایكی وبرایەكی دایك وباوكی، بە پێی قەزاوەتی ئیمامی عومەر (خوای لێ ڕازی بێت)، كە لەم مەسەلەیەدا دوو خوشكە دایكیەكە وبرا دایك وباوكیەكە دەبن بە هاوبەش لە سێیەكدا.[1]

---

(١) جا ئەم مەسەلەیە بە (مشرّكة) ناسراوە، كە مەسەلەكەش ئەمەیە:
ژنێك بمرێت: مێرد، ودایك یان داپیرە، ودوو یان زیاتر براو خوشكی دایكی، وبرایەكی دایك وباوكی یان زیاتری لەپاش بەجێ بمێنێت، جا ئیتر ئەو برا دایك وباوكیە خوشكی دایك وباوكی لەگەڵدا بێت یان نا.
ئێستا: مێردەكە نیوە دەبات، ودایكەكە شەش یەك دەبات، وبرا وخوشكە دایكیەكان سێ یەك دەبەن، وبرا دایك وباوكیەكانیش عەصەبەن، بەمەش ئەصڵی مەسەلەكە لە شەشە (٦)، سێ (٣) بۆ مێردەكە، یەك (١) بۆ دایكەكە، دوو (٢) بۆ برا وخوشكە دایكیەكان، بەمەش هیچ نەمایەوە بۆ برا دایك وباوكیەكان.
بەڵام لێرەدا برا دایك وباوكیەكە دێتە پێشەوە، ودەڵێت: خۆ من بەڵێ لەگەڵ برا وخوشكە دایكیەكاندا ڕاستە كە باوكمان جیاوازە، بەڵام خۆ دایكمان یەك دایكە، ئیتر بۆچی ئەوان بەش ببەن، ومن هیچ نەبەم؟!
بۆیە كاتێك كە ئەم مەسەلەیە برایە خزمەتی حەزرەتی عومەر (خوای لێ ڕازی بێت)، ویستی برا دایك وباوكیەكان بێ بەش بكات، ئیتر ئەوانیش وتیان: وەها دابنێ كە باوكمان بەردێكە، وفڕێدراوەتە ناو ئەو ئاوەوە، یان وا دابنێ كە باوكمان كەرێك بووە!، خۆ دایكمان لەگەڵ برا، وخوشكە دایكیەكاندا یەك دایكە (ئیتر بۆچی ئەوان بەشیان هەیە، وئێمە هیچ)؟! جا حەزرەتی عومەر قسەكەیانی پێ جوان بوو، هەر لەبەر ئەوە بە خزمایەتی دایكیان ئەمانیشی بەشدار كرد لە بەشی برا وخوشكە دایكیەكان.
ئیتر بە گوێرەی بڕیارەكەی حەزرەتی عمر بوون بە هاوبەشی برا وخوشكە دایكیەكان لە سێ یەكەكەدا، وبەبێ جیاوازی لە نێوان نێر ومێ دا سێ یەكەكە دابەش دەكرێت بە سەریاندا بە پێی ژمارەی سەرەكانیان، بەمەش ژمارەی ئەو كەسانەی كە سێ یەكەكەیان دەكەوێت بوو بە سێ كەس، وسێ یەكەكەش كە دوو (٢) بوو دابەش ناكرێت بەسەر سێ دا، بۆیە بۆ ساغ كردنەوەی مەسەلەكە دەبێت ئەصڵی مەسەلەكە لێكدانی سێ (٣) بكەین، ئەو كاتە ئەصڵی مەسەلەكە دەبێت بە هەژدە (١٨)، ئەوجا لەم هەژدەیە، نۆ (٩) بۆ مێردەكە، وسێ (٣) بۆ دایكەكە، وشەش (٦) بۆ دوو برا، یان دوو خوشكە دایكیەكە، بە هاوبەشی لەگەڵ برا دایك وباوكیەكە، بەمەش هەر یەكەیان دوو (٢) بەشیان دەكەوێت، بە بێ جیاوازی لە نێوان نێر ومێ (چونكە ئەوەی كە دەیان كەوێت لەڕێگەی بەش بردنەوەیە، نەك لە ڕێگەی عەصەبەگەرایەتی). هەروەها ئەم مەسەلەیە پێشی دەوترێت: الحجرية، اليمية، الحمارية.

٧. نێرینەیەك یان مێیینەیەك بە تەنها میرات بەر بن، کەواتە ئەگەر کوڕ بوو بە تەنها ئەوا هەموو میراتەکە دەبات بە عەصەبەگەرایەتی، ئەگەر کچێك بوو بە تەنها، ئەوا نیوەی میراتەکە دەبات، وەك خاوەن بەشی دیاری کراو، نیوەکەی تریشی بۆ ڕەد دەکرێتەوە، هەروەها ئەگەر باوك بە تەنها بێت، ئەوا هەموو میراتەکە دەبات بە عەصەبەگەرایەتی، ئەگەر دایکیش بێت بە تەنها ئەوا سێ یەکی میراتەکە دەبات وەك خاوەن بەشی دیاری کراو، پاشماوەکەشی بۆ ڕەد دەکرێتەوە.

٨. خوشکی دایك وباوکی (یان تەنها باوکی)، ئەگەر کۆبویەوە لەگەڵ مێرد، لەم کاتەدا هەر وەك ئەوە وەهایە کە برایەکی دایك وباوکی لەگەڵ مێرددا

---

- ....................

| میرات بەرەکان | بەشەکانیان | ئەصڵی مەسەلە | سەهمەکان |
|---|---|---|---|
| دایك | شەش یەك | | ١ |
| مێرد | نیوە | ٦ | ٣ |
| برا وخوشکی تەنها دایکی | سێ یەك | | ٢ |
| برای باوك ودایکی | عەصەبە | | |

جا وەك لە نموونەکە دا دەردەکەوێت، لەم مەسەلەیە دا پێنج مەرج پێویستە:

✓ دەبێت مەسەلەکە میرات بەرێکی تێدا بێت، کە شەش یەك ببات، وەك دایك، وداپیرە.

✓ منداڵی دایکی، دەبێت لە یەك زیاتر بن، جیاوازی نییە لەوە دا کە نێرینە بێت، یان مێیینە، یان نێرینە ومێیینە بەیەکەوە، چونکە: ئەگەر یەك کوڕ، یان یەك کچ بێت، ئەوا: خاوەن بەشەکان هەموو میراتەکە نابەن، بەڵکو پاشماوەیان لێ دەمێنێتەوە بۆ برا دایك وباوکیەکان.

✓ دەبێت منداڵە دایك وباوکیەکان، نێرینەیان تێدا بێت، جا ئیتر مێیینەیان لەگەڵ دا بێت، یان نا، چونکە ئەگەر بە تەنها مێیینە بن، ئەوا: بەشی دیاری کراوی خۆیان هەیە، وبێ بەش نابن، بەڵکو بەشەکەی خۆیان دەبەن، وئەگەر ئەصڵی مەسەلەکەش پێویست بە زیاد کردن (عول) بکات، زیادی دەکەین.

✓ ئەو برا وخوشکانەی کە دەبنە هاوبەش دەبێت براو خوشکی دایك وباوکی بن.

✓ دەبێت مەسەلەکە مێردی تێدا بێت، واتە دەبێت مردووەکە ژن بێت، ومێردەکەی مابێت. (وەرگێڕ)

کۆ بووبێتەوە، چونکە مێردەکە نیوە دەبات وەك خاوەن بەشی دیاری کراو، وبراکەش نیوەکەی تر دەبات بە عەصەبەگەرایەتی، ئەگەر مێرد وخوشکەکەش بن، ئەوا مێردەکە هەر بەهەمان شێوە نیوە دەبات، و خوشکەکەش نیوەکەی تر دەبات، ئەویش وەك خاوەن بەشی دیاری کراو.(١)

٩. خوشکێکی دایکی لەگەڵ برایەکی دایك وباوکی، ئەمەش لە کاتێکدا کە ژنێك بمرێت: مێرد، ودایك، وخوشکێکی دایکی، وبرایەکی دایك وباوکی لە پاش بەجێ بمێنێت. ئەوا: مێردەکە نیوە دەبات، ودایکەکەش شەش یەك دەبات، وخوشکەکەش شەش یەك دەبات، وپاشماوەکەش (کە دەکاتە: شەش یەك) براکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

١٠. خزمانی سك (**ذو الأرحام**) بەلای مەزهەبی (**أهل الرحم**)ەوە، کە ئەم مەزهەبە لە مادە (٣١)ی یاسای باری کەسێتی (**مصر**) ی ژمارە (٧٧)ی ساڵی (١٩٤٣) کاری پێ دەکرێت. ئەمانیش لە کاتێکدا کە مردووەکە میرات بەری خاوەن بەشی دیاری کراوی نەبێت، وعەصەبەشی نەبێت، ئەوا ئەم کۆمەڵە خزمە میراتەکە بە یەکسانی لە نێوانیاندا دابەش دەکرێت، بەبێ جیاوازی لە نێوان نێرینە ومێیینە، وەك ئەوەی کە مردوەکە کچی کچێك وکوڕی کچێك وخاڵ وپوورێکی لە پاش بەجێ بمێنێت، ئەوا هەموویان وەك یەك میرات دەبەن.(٢)

---

(١) چونکە خوشك ئەگەر یەك دانە بێت ئەوا نیوە دەبات. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...إِنِ امْرُؤٌا هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ﴾. النساء/ ١٧٢.

(٢) بۆ چۆنێتی میرات بردنی (ذوي الأرحام) زانایان بوون بە سێ بەشەوە: هەندێکیان پێیان دەوترێت (مذهب اهل التنزيل)، هەندێکیشیان پێیان دەوترێت: (مذهب أهل القرابة)، هەندێکی تریشیان پێیان دەوترێت: (مذهب أهل الرحم)، جا درێژەی باسی هەریەك لەم سێ مەزهەبە لە زۆرێك لە سەرچاوە وکتێبە فیقهیەکاندا باس کراوە. بڕوانە: المغني لابن قدامة/ ب٦/ ل٢٣٦. (وەرگێڕ)

١١. شەش کەس هەن کە هەرگیز بە تەواوەتی لە میرات بێبەش ناکرێن، ئەوانیش: سێ نێرینە، وسێ مێیینەن، نێرینەکان بریتین لە: (مێرد وکوڕ وباوك)، مێیینەکانیش بریتین لە {ژن (واتە: هاوسەر)، وکچ ودایك}.[١]

## ئەو حاڵەتانەی کە مێیینە لە نێرینە زیاتر میرات دەبات

١. مێرد لەگەڵ تەنها کچێك.[٢]
٢. مێرد لەگەڵ دوو کچ.[٣]
٣. کچێك لەگەڵ چەند مامێکیدا.[٤]
٤. ئەگەر ژنێك بمرێت، و(٦٠) دۆنم زەوی[٥] لەپاش بەجێ بمێنێت، وئەم میرات بەرانەشی هەبێت: مێرد، وباوك، ودایك، ودوو کچ. ئەوا مێردەکە

---

(١) پێم وایە ئەم خاڵە پەیوەندی بەم باسەوە نییە، چونکە دانەر لێرەدا دەیەوێت باسی ئەو حاڵەتانە بکات کە مێیینە ونێرینە لە بڕی بەشە میراتدا وەك یەك ویەکسانن، بەڵام ئەوەی کە لەم خاڵەدا هاتووە باس لە حاڵەتی لەیەك چوونی مێیینە ونێرینە دەکات، لەوەدا کە ئەو دوو کۆمەڵە لە هەردوو ڕەگەز، هەرگیز بە تەواوەتی لە میرات بێ بەش ناکرێن، ئەگینا ئەوە شتێکی زانراوە کە بەشە میراتی ئەم مێیینە ونێرینانە بە شێوەیەکی گشتی ولە زۆرێك لە حاڵەتەکاندا جیاوازن. (وەرگێڕ)
(٢) مێردەکە چواریەك دەبات، وکچەکەش نیوە دەبات وەك خاوەن بەشی دیاری کراو، وئەوەش کە دەمێنێتەوە دەگەڕێنرێتەوە بۆ کچەکە بەلای زۆرینەی زانایانەوە. (وەرگێڕ)
(٣) مێردەکە چواریەك دەبات، ودوو کچەکەش دووسێ یەك دەبەن وەك خاوەن بەشی دیاری کراو، وپاشماوەکەشیان بۆ دەگەڕێنرێتەوە. (وەرگێڕ)
(٤) کچەکە بەتەنها نیوە دەبات وەك خاوەن بەشی دیاری کراو، ومامەکانیشی (کە برای مردووەکەن) بە هەموویانەوە نیوەکەی تر دەبەن بە عەصەبەگەرایەتی. (وەرگێڕ)
(٥) بەو پێیەی کە مامۆستای دانەر خەڵکی وڵاتی (مصر)ە، بۆیە لێرەدا وشەی (فدان)ی بەکار هێناوە، کە بە مەتر چوارگۆشە دەکاتە (٤٠٤٦)م، بەڵام تەنها لەبەر زیادە ڕوونی من وشەکەم گۆڕیوە بە (دۆنم)، چونکە ئەم پێوەرە زیاتر لە کوردستاندا باوە بۆ پێوانە کردنی زەوی، ئەگینا شێواز وڕێسا وئەمانەتی کاری وەرگێڕان وەها دەخوازێت کە بە ئەمانەتەوە هەموو وشەکان لە نووسراوەکەدا چۆن هاتبن، هەر بەو شێوەیە بهێنرێنەوە. (وەرگێڕ)

چواریەك دەبات، وباوك ودایكەكەش هەریەكەیان شەش یەك دەبەن، ودوو كچەكەش دووسێ یەك دەبەن، كەواتە ئەصڵی مەسەلەكە بریتیە لە دوازدە (١٢)، بەمەش مێردەكە سێ بەش دەبات، وباوك ودایكەكەش هەر یەكەیان دوو بەش دەبەن، ودوو كچەكەش هەشت بەش دەبەن، كەواتە دەبێت مەسەلەكە عەولی تێدا بكرێت تا دەگاتە پازدە (١٥)، جا ئێستا ئەگەر بێینە سەر دابەش كردنی (٦٠) دۆنمەكە، ئەوا هەردوو كچەكە بەیەكەوە (٣٢) دۆنم دەبەن (واتە: یەكی (١٦) دۆنم). بەڵام ئەگەر لە جێگەی ئەم دوو كچە، مردوەكە دوو كوڕی هەبوایە، ئەوا كوڕەكان عەصەبە بوون، وپاشماوەی بەشی خاوەن بەشەكانیان دەبرد، ومەسەلەكەش پێویستی بە عەول نەدەكرد، وئەو كاتەش بە هەردوو كوڕەكەوە (٢٥) دۆنمیان دەبرد، بەمەش بەشی دوو كچەكە لە بەشی دوو كوڕەكە زیاتر دەبوو.

٥. ئەگەر ژنێك بمرێت، و(٤٨) دۆنمی لەپاش بەجێ بمێنێت، وئەم میرات بەرانەشی هەبێت: مێرد، ودوو خوشكی دایك وباوكی، ودایك، ئەوا مێردەكە نیوە دەبات، ودایكەكەش شەش یەك دەبات، ودوو خوشكەكەش دووسێ یەك دەبەن، كەواتە ئەصڵی مەسەلەكە بریتیە لە شەش (٦)، بەمەش مێردەكە سێ بەش دەبات، ودایكەكەش یەك بەش دەبات، وخوشكەكانیش چوار بەش دەبەن، كەواتە دەبێت مەسەلەكە عەولی تێدا بكرێت بۆ هەشت (٨). ئێستا ئەگەر بێینە سەر دابەش كردنی (٤٨) دۆنمەكە، ئەوا هەردوو خوشكەكە بەیەكەوە (٢٤) دۆنم دەبەن (واتە: یەكی (١٢) دۆنم). بەڵام ئەگەر لە جێگەی ئەم دوو خوشكە مردوەكە دوو برای دایك وباوكی هەبوایە، ئەوا براكان عەصەبەبوون، وپاشماوەی بەشی خاوەن بەشەكانیان دەبرد، ومەسەلەكەش پێویستی بە عەول نەدەكرد، وئەو كاتەش بە هەردوو براكەوە (١٦) دۆنم دەبەن، بەمەش بەشی دوو خوشكەكە لە بەشی دوو براكە زیاتر دەبێت. هەروەها لەم مەسەلەدا

ئەگەر خوشكی تەنها باوكیش بن، ولە جێگەی ئەوان برای تەنها باوكی دابنرێت، ئەوا خوشكەكان هەر لە براكان زیاتر دەبەن.

٦. هەمان مەسەلەی پێشوو، بەڵام ئەگەر دوو خوشكی باوكی لە پاش بەجێ بمێنێت، ئەوا ئەمانیش هەر لە برا باوكیەكان زیاتر میرات دەبەن.

٧. ئەگەر ژنێك بمرێت، و(١٥٦) دۆنمی لەپاش بەجێ بمێنێت، وئەم میرات بەرانەشی هەبێت: مێرد، وباوك، ودایك، وكچێك. ئەوا مێردەكە چواریەك دەبات، وباوك ودایكەكەش هەریەكەیان شەش یەك دەبەن، وكچەكەش نیوە دەبات. كەواتە ئەصڵی مەسەلەكە بریتیە لە دوازدە (١٢)، بەمەش مێردەكە سێ بەش دەبات، وباوك ودایكەكەش هەر یەكەیان دوو بەش دەبەن، وكچەكەش شەش بەش دەبات، كەواتە دەبێت مەسەلەكە عەولی تێدا بكرێت تاوەكو دەگاتە سیازدە (١٣). ئێستا ئەگەر بێینە سەر دابەش كردنی (١٥٦) دۆنمەكە، ئەوا كچەكە (٧٢) دۆنم دەبات. بەڵام ئەگەر لە جێگەی ئەم تەنها كچە مردوەكە كوڕێكی هەبوایە، ئەوا ئەم كوڕە عەصەبە دەبوو، وپاشماوەی بەشی خاوەن بەشەكانیان دەبرد، ومەسەلەكەش پێویستی بە عەول نەدەكرد، وئەو كاتەش كوڕەكە (٦٥) دۆنمی دەبرد، بەمەش بەشی كچەكە لە بەشی كوڕەكە زیاتر دەبوو.

٨. ئەگەر ژنێك بمرێت، و(٤٨) دۆنمی لەپاش بەجێ بمێنێت، ئەم میرات بەرانەشی هەبێت: مێرد، و خوشكێكی دایك وباوكی، و دایك. ئەوا مێردەكە نیوە دەبات، دایكەكەش شەش یەك دەبات، خوشكەكەش نیوە دەبات. كەواتە ئەصڵی مەسەلەكە بریتیە لە شەش(٦)، بەمەش مێردەكە سێ بەش دەبات، دایكەكەش یەك بەش دەبات، خوشكەكەش سێ بەش دەبات، كەواتە دەبێت مەسەلەكە عەولی تێدا بكرێت بۆ حەوت (٧). ئێستا ئەگەر بێینە سەر دابەشكردنی(٤٨) دۆنمەكە، ئەوا خوشكەكە (١٨) دۆنم دەبات. بەڵام ئەگەر لە جێگەی ئەم تەنها خوشكە مردوەكە برایەكی دایك و باوكی هەبوایە، ئەوا براكە عەصەبە دەبوو، وپاشماوەی بەشی خاوەن

بەشەكانیان دەبرد، ومەسەلەكەش پێویستی بە عەول نەدەكرد، وئەو كاتەش براكە (٨) دۆنمی دەبرد، بەمەش بەشی خوشكەكە لە بەشی براكە زیاتر دەبێت. هەروەها لەم مەسەلەدا ئەگەر خوشكێكی تەنها باوكیش بێت، ولە جێگەی ئەو برایەكی تەنها باوكی دابنرێت، ئەوا خوشكەكە هەر لە براكە زیاتر دەبات.

٩. ئەگەر پیاوێك بمرێت، و(٤٨) دۆنمی لەپاش بەجێ بمێنێت، وئەم میرات بەرانەشی هەبێت: ژنێك، ودایك، دوو خوشكی تەنها دایكی، ودوو برای دایك وباوكی، ئەوا ژنەكە چواریەك دەبات، ودایكەكەش شەش یەك دەبات، وخوشكە دایكیەكانیش سێ یەك دەبەن، وبراكانیش عەصەبەن، كەواتە ئەصڵی مەسەلەكە بریتیە لە دوازدە (١٢). بەمەش ژنەكە سێ بەش دەبات، ودایكەكەش دوو بەش دەبات، وخوشكەكانیش چوار بەش دەبەن، وسێ بەشیش دەمێنێتەوە بۆ دوو براكە. ئێستا ئەگەر بێینە سەر دابەش كردنی (٤٨) دۆنمەكە، ئەوا دوو خوشكەكە (١٦) دۆنم دەبەن (واتە: یەكی (٨) دۆنم)، بەلاّم دوو براكە (١٢) دۆنم دەبەن (واتە: یەكی (٦) دۆنم)، بەمەش بەشی خوشكەكان لە بەشی براكان زیاتر دەبوو.

١٠. ئەگەر ژنێك بمرێت، و(١٢٠) دۆنمی لەپاش بەجێ بمێنێت، وئەم میرات بەرانەشی هەبێت: مێرد، وخوشكێكی دایكی، ودوو برای دایك وباوكی. ئەوا مێردەكە نیوە دەبات، وخوشكەكەش سێ یەك دەبات، وبراكانیش عەصەبەن. كەواتە ئەصڵی مەسەلەكە بریتیە لە شەش (٦). بەمەش مێردەكە سێ بەش دەبات، كە دەكاتە شەست (٦٠) دۆنم، وخوشكەكەش دوو بەش دەبات، كە دەكاتە چل (٤٠) دۆنم، ویەك بەشیش دەمێنێتەوە بۆ دوو براكە، كە دەكاتە بیست (٢٠) دۆنم. كەواتە بەشی یەك خوشكەكە لە بەشی

هەردوو براکە زیاترە.[١]

١١. دایك لەگەڵ مێرددا، کاتێکدا کە مردوەکە لقی میراتبەری نەبێت (واتە: منداڵ، یان منداڵی کوڕی نەبێت) بەلای مەزهەبی ئیبنو عەباسەوە. جا ئەگەر پیاوێك[٢] بمرێت، وباوك ودایك ومێردی لەپاش بەجێ بمێنێت، ئەوا مێردەکە نیوە دەبات. دایکەکەش سێ یەك دەبات، پاشماوەکەش (کە شەش یەکە) باوکەکە دەیبات، واتە بە ئەندازەی نیوەی بەشی دایکەکە (کە ژنی باوکەکەیە).

١٢. ئەگەر ژنێك بمرێت، و(٦٠) دۆنمی لەپاش بەجێ بمێنێت، وئەم میراتبەرانەشی هەبێت: مێرد، ودایك، وخوشکێکی تەنها دایکی، ودوو برای دایك وباوکی، ئەوا مێردەکە نیوە دەبات، دایکەکەش شەش یەك دەبات، وخوشکەکەش شەش یەك دەبات، وبراکانیش عەصەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسەلەکە بریتیە لە شەش (٦)، بەمەش مێردەکە سێ بەش دەبات، و

(١) بەڵام لە ڕاستیدا ئەم نموونەیە بەم شێوەیە حەل ناکرێت. بەڵکو ڕاستیەکەی ئەمەیە: مێردەکە نیوە دەبات، وخوشکەکەش شەش یەك دەبات (چونکە بە تەنهایە) خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ ۚ ﴾ النساء/ ١٢، وبراکانیش عەصەبەن. بەمەش مێردەکە سێ بەش دەبات، وخوشکەکەش یەك بەش دەبات، ودوو بەشیش دەمێنێتەوە بۆ دوو براکە. کەواتە بەشی خوشکەکە یەکسانە لەگەڵ بەشی هەریەك لە دوو براکە. بۆیە پێم وایە کە وەك ڕێزێك لە توانا وپێگەی زانستی مامۆستای دانەر، ئەم نموونەیە ئەگەر بۆ ئەم باسە بگونجێت، دەبێت بەم شێوەیە بێت: ژنێك مردوە: مێرد، ودوو خوشکی دایکی، ودوو برای دایك وباوکی لەپاش بەجێ ماوە. مێردەکە نیوە دەبات، ودوو خوشکەکەش سێ یەك دەبەن، ودوو براکەش عەصەبەن، بەمەش مێردەکە سێ بەش دەبات، وخوشکەکانیش دوو بەش دەبەن، وبراکانیش یەك بەشیان بۆ دەمێنێتەوە، کەواتە بەشی هەریەك لە خوشکەکان بە تەنها یەکسانە بە بەشی هەردوو براکە پێکەوە. (وەرگێڕ)

(٢) دەبێت ئەم مردوە ژن بێت، ئەگینا چۆن دەبێت پیاو بمرێت ومێردیش بمێنێت!!. (وەرگێڕ)

دایکەکەش یەك بەش دەبات، وخوشکەکەش یەك بەش دەبات، ویەك بەشیش دەمێنێتەوە بۆ دوو براکە، بەمەش ئەو تەنها خوشکە بە ئەندازەی هەردوو براکە میرات دەبات جا ئێستا ئەگەر بێینە سەر دابەش کردنی (٦٠) دۆنمەکە، ئەوا خوشکەکە خۆی بە تەنها (١٠) دۆنم دەبات، بەلاّم هەردوو براکە بەیەکەوە (١٠) دۆنم دەبەن (واتە: یەکی (٥) دۆنم).

١٣. ئەگەر پیاوێك بمرێت، و(٥٧٦) دۆنمی لەپاش بەجێ بمێنێت، وئەم میرات بەرانەشی هەبێت: ژن، وباوك، ودایك، وکچێك، وکچی کوڕێك. ئەوا بەشی کچی کوڕەکە لەو بڕە پارەیە دەکاتە نەوەد وشەش (٩٦) دۆنم، لە کاتێکدا ئەگەر لە جێگەی ئەم کچی کوڕە، کوڕی کوڕێك بوایە، ئەوا بیست وحەوت (٢٧) دۆنمی دەبرد.[1]

---

(١) لە ڕاستیدا ئەم نموونەیەش خۆی بۆ ئەم باسەی کە تێیداین ڕاستە، کە مێیینە لە نێرینە زیاتر میرات دەبات، بەلاّم لە چۆنێتی حەل کردن ودیاری کردنی بەشی کچی کوڕەکە وکوڕی کوڕەکەدا هەڵەی تێدایە، چونکە حەل کردنەکەی بەم شێوەیە: ژنەکە هەشت یەك دەبات، وباوکەکەش شەش یەك دەبات، ودایکەکەش شەش یەك دەبات، وکچەکەش نیوە دەبات، وکچی کوڕەکەش شەش یەك دەبات. کەواتە ئەصڵی مەسەلەکە بریتیە لە بیست وچوار (٢٤). بەمەش ژنەکە سێ بەش دەبات، وباوکەکە ودایکەکە وکچی کوڕەکەش هەریەکەیان چوار بەش دەبەن، وکچەکەش دوانزە بەش دەبات، کە سەرجەم ئەم بەشانە (٢ + ٤ + ٤ + ٤ + ١٢) دەکاتە بیست وحەوت (٢٧). بۆیە دەبێت مەسەلەکە عەولی تێدا بکرێت، تاوەکو دەگاتە بیست وحەوت، ئیتر لەوێدا مەسەلەکە ڕاست دەردەچێت. جا ئەگەر لە تەواوی میراتەکە بەشی کچی کوڕەکە دەربهێنین، ئەوا بەم شێوەیە دەبێت: (٥٧٦ ÷ ٢٧ = ٢١,٣٣) ئەوجا ئەم ژمارەیە لێکدانی (٤) دەکەین، کە بەشی کچی کوڕەکەیە، بەم شێوەیە (٢١,٣٣ × ٤ = ٨٥,٣٢). بەلاّم بە هەرحاڵ نموونەکە هەر ڕاستە، ومەبەستەکەش دەپێکێت، وبەشی کچی کوڕەکە هەر لە بەشی کوڕی کوڕەکە زیاترە. چونکە لەم نموونەیەدا ئەگەر لە بڕێتی کچی کوڕەکە، کوڕی کوڕێك دابنێین، ئەوا مەسەلەکە بەم شێوەیەی لێ دێت: ژنەکە هەشت یەك دەبات، ودایك وباوکەکەش هەر یەکەیان شەش یەك دەبەن، وکچەکەش نیوە دەبات، وکوڕی کوڕەکەش عەصەبەیە. بەمەش ژنەکە سێ بەش دەبات، وهەریەك لە دایك وباوکەکەش بە تەنها چوار بەش دەبەن، وکچەکەش دوانزە بەش دەبات، بەمەش تەنها یەك بەش دەمێنێتەوە بۆ کوڕی کوڕەکە، ومەسەلەکەش پێویست بە عەول تێدا کردن ناکات. جا ئەگەر ئەو یەك بەشە لە بڕی (٥٧٦) دۆنمەکە دەربهێنین، ئەوا بەم

١٤. ئەگەر کەسێك بمرێت، و(٦٠) دۆنمی لەپاش بەجێ بمێنێت، وئەم میرات بەرانەشی هەبێت: دایك، ودایکی دایك، ودایکی باوك. ئەوا دایکەکە شەش یەك دەبات، وەك خاوەن بەشی دیاری کراو، وپاشماوەکەشی بۆ ڕەد دەگرێتەوە (چونکە بە بوونی دایك، هەریەکە لە دایکی دایك ودایکی باوکیش بە تەواوی لە میرات بێ بەش دەبن). بەڵام ئەگەر لە جێگەی دایکەکە باوك بوایە، واتە میرات بەرەکان بریتی بوونایە لە: باوك، ودایکی باوك، ودایکی دایك، ئەوا دایکی دایکەکەش میراتی دەبرد، وبە باوکەکە بێ بەش نەدەبوو. واتە مەسەلەکە بەم شێوەیەی لێ دەهات: باوکەکە شەش یەك دەبات، ودایکی دایکەکەش شەش یەك دەبات، ئەوجا پاشماوەکەش دەدرێت بە باوکەکە بە عەصەبەگەرایەتی. کەواتە لە مەسەلەی یەکەمدا دایکەکە تەواوی (٦٠)دۆنمەکەی دەبرد، بەڵام لە مەسەلەی دووەمدا باوکەکە (٥٠)دۆنمی دەبرد،{و دە(١٠)دۆنمەکەی تر بۆ دایکی دایکەکە بوو} .

## ئەو حاڵەتانەی کە مێینە میرات دەبات، بەڵام ئەگەر نێرینە لە جێگەی ئەو بێت میرات نابات

١. ئەگەر ژنێك بمرێت، و(١٩٥) دۆنمی لەپاش بەجێ بمێنێت، وئەم میرات بەرانەشی هەبێت: مێرد، وباوك، ودایك، وکچێك، وکچی کوڕێك، ئەوا مێردەکە چواریەك دەبات، وهەریەکە لە باوك ودایکەکەش شەش یەك دەبەن، وکچەکەش نیوە دەبات، وکچی کوڕەکەش شەش یەك دەبات، کەواتە ئەصڵی مەسەلەکە بریتیە لە دوازدە (١٢). مێردەکە سێ بەش

---

شێوەیە دەبێت: (٥٧٦ ٢٤ = ٢٤). کەواتە بەشی کوڕی کوڕەکە هەر لە بەشی کچی کوڕەکە کەمترە. (وەرگێڕ)

دەبات، وباوك ودایكەكەش هەر یەكەیان دوو بەش دەبەن، وكچەكەش شەش بەش دەبات، وكچی كوڕەكەش دوو بەش دەبات، بەمەش كۆی سەرجەم بەشەكان دەكاتە پانزە (١٥). بۆیە پێویست دەكات ئەصڵی مەسەلەكە عەولی تێدا بكرێت تاوەكو دەگاتە: پازدە (١٥)، لەبەر ئەوەی كە هەم بەشی كچەكە، وهەم بەشی كچی كوڕەكە تەواو ببن. ولەم مەسەلەیەدا كچی كوڕەكە (٢٦) دۆنم دەبات. بەڵام ئەگەر لەم مەسەلەیەدا لە جێگەی ئەو كچی كوڕە ئەگەر كوڕی كوڕێك بوایە، ئەوا عەصەبە دەبوو، مەسەلەكەش تەنها عەولی تێدا دەكرا بۆ سیازدە (١٣) بۆ ئەوەی كە بەشی كچەكە تەواو ببێت، ئیتر هیچ نەدەمایەوە بۆ كوڕی كوڕەكە، ولە میراتەكەش بێ بەش دەبوو. بەڵام ئەم دابەش كردنە بە پێچەوانەی یاسای وەسێتی پێویستەوەیە (**الوصیة الواجبة**)[1] كە یاسی (**مصر**)ی ژمارە (٧١)ی ساڵی (١٩٤٦) پێی وەرگرتووە، كە بە پێچەوانەی مەزهەبەكانە، ئێمەش قسە لە بارەی مەزهەبە متمانەدارەكانەوە دەكەین، وباس لەوە دەكەین كە چۆن میرات دەدات بە مێیینە، ونایدات بە نێرینەیەكی هاو وێنەی ئەو مێیینە.

---

(١) وەسێتی پێویست، بۆ ئەو حاڵەتەیە كە میرات بەرێك بە هۆی میرات بەرێكی تر یان بە هۆی چەند میرات بەرێكی ترەوە لە میرات بێ بەش بكرێت، ئەو كاتە وەها دادەنرێت كە مردوەكە وەسێتی كردووە بۆ ئەو میرات بەرە، كە بە ئەندازەی بەشی ئەو كەسەی بدرێتێ كە ئەم بە هۆیەوە دەگات بە مردوەكە، بەڵام بەو مەرجەی كە لە سێ یەكی میراتەكە تێنەپەڕێت، واتە لەم نموونەیەدا، دەبێت كوڕی كوڕەكە بە ئەندازەی كوڕێكی بدرێتێ. وە ئەم جۆرە وەسێتە لە مادەی (٧٤)ی یاسای باری كەسێتی عێراقی ژمارە (١٨٨)ی ساڵی (١٩٥٩)دا هاتووە كە ئەمە دەقەكەیەتی بە وەرگێڕاوی: ((ئەگەر منداڵ، نێر بێت یان مێ، بەر لە مردنی باوكی یان دایكی، مرد، ئەوا ئەو منداڵە مردووە بە زیندوو دادەنرێت لە كاتی مردنی هەریەك ئەواندا، وە بەشە میراتەكەی دەگواسترێتەوە بۆ منداڵەكانی، چی نێرینە بن یان مێیینە، بە پێی بڕیارەكانی شەریعەتی ئیسلام، بەو پێیەی كە بە وەسێتی واجب وپێویست دادەنرێت، بەڵام بە مەرجێك كە لە سێ یەكی میراتەكە تێ نەپەڕێت)) (وەرگێڕ)

٢. ئەگەر ژنێك بمرێت، و(٨٤) دۆنمی لەپاش بەجێ بمێنێت، وئەم میرات بەرانەشی هەبێت: مێرد، وخوشكێكی دایك وباوكی، وخوشكێكی تەنها باوكی، ئەوا خوشكە تەنها باوكیەكە شەش یەك دەبات، كە دەكاتە: دوانزە (١٢) دۆنم. بەڵام ئەگەر لە جێگەی ئەم خوشكە باوكیە، برایەكی باوكی هەبوایە، ئەوا هیچ میراتی نەدەبرد. چونكە مێردەكە نیوەی دەبرد، وخوشكە دایك وباوكیەكەش نیوەی دەبرد، وبراكەش عەصەبە بوو، بۆیە هیچی بۆ نەدەمایەوە.

٣. میراتی داپیرە، داپیرە لە زۆر مەسەلەدا میرات دەبات، بەڵام ئەگەر لەجێگەی ئەو باپیرە بوایە، ئەوا میراتی نەدەبرد. بە ئاگادار بوون بەسەر ڕێسای میرات بردنی باپیرە وداپیرە ئەمانەمان دەست دەكەوێت: باپیرەی درووست وساغ (واتە: میرات بەر) بەو باپیرەیە دەوترێت كە لە زنجیرەی خزمایەتیەكەی بۆ مردوەكە مێیینەی تێدا نییە، وەكو: باوكی باوك، یان باوكی باوكی باوك، وئیتر بەرو ژوورتریش. بەڵام باوكی دایك، یان باوكی دایكی دایك (هەروەها باوكی دایكی باوكیش) ئەمانە بە باپیرەی پووچەڵ (واتە: میرات نەبەر) ناو دەبرێن. داپیرەی درووست وساغیش ئەو داپیرەیە كە باپیرەیەكی نادرووست نییە لە زنجیرەی خزمایەتیەكەیدا بۆ مردوەكە، یان بەو داپیرەیە دەوترێت كە لە زنجیرەی خزمایەتیەكەی بۆ مردوەكەدا نێرینەیەك نییە لە نێوان دوو مێیینەدا. هەر بۆیە دایكی باوكی دایك بە داپیرەی نادرووست وپووچەڵ دادەنرێت، بەڵام دایكی دایك ودایكی دایكی باوك بە داپیرەی درووست دادەنرێن، ومیراتیش دەبەن.

٤. ئەگەر كەسێك بمرێت: باوكی دایك (بابە گەورە یان باپیرە)، ودایكی دایك (دایە گەورە یان داپیرە)ی لەپاش بەجێ بمێنێت، ئەوا دایكی دایكەكە هەموو میراتەكە دەبات، چونكە شەش یەك دەبات وەك خاوەن بەش، وپاشماوەكەشی بۆ ڕەد دەكرێتەوە. بەڵام باوكی دایكەكە میرات نابات، چونكە باپیرەی نادرووستە وبە (ذوي الأرحام) دادەنرێت.

٥. بە هەمان شێوە ئەگەر کەسێك بمرێت: دایکی دایکی دایك، وباوکی دایکی دایکی لەپاش بەجێ بمێنێت. ئەوا دایکی دایکی دایکەکە هەموو میراتەکە دەبات، بەڵام باوکی دایکی دایکەکە هیچ میرات نابات، چونکە باپیرەی نادرووست ومیرات نەبەرە.

کەواتە لێرەدا زیاتر لە سی (٣٠) حاڵەت هەیە کە تێیاندا مێیینە یان وەکو نێرینە میرات دەبات، یان لەو زیاتر، یان مێیینە میرات دەبات، ونێرینەی هاو وێنەی میرات نابات، ئەمەش لە بەرامبەر چوار حاڵەتی دیاری کراو کە مێیینە تێیاندا نیوەی نێرینە میرات دەبات. ئەمەش بەرهەمی ئەو بەدواداچوون وگەڕان وپشکنینەیە کە بۆ حاڵەتەکان ومەسەلەکانی میرات بردن کراوە لە زانستی (فرائض)دا. بۆیە من وەهای دەبینم کە لەپاش ئەم ڕوون کردنەوانە، ئیتر ئەو گومانە نامێنێت لەلای کەسێك کە لەگەڵ خۆیدا بە ویژدان وڕاستگۆ بێت.[1] داوا لە خوای گەورە دەکەین کە خۆی چاودێریمان بکات وبمان پارێزێت، وسوپاسیش بۆ پەروەردگاری هەموو بوونەوەران.

---

(١) منیش ئەڵێم: ئەو گومان وخەرافات وساختەکاری وچەواشەکردنە با بەس بێت. ڕەخنە ئەگەر بابەتی وبونیاتنەرانە بێت، هەموو کەس وهەموو لایەنێك پێی ڕازیە. بەڵام هەڵبەستنی درۆی بێ بناغە، وخەڵەتاندنی خەڵکی سادە ونەشارەزا دەکرێت بۆ ماوەیەك سەربگرێت، بەڵام هەرکەس کە بیەوێت بەشوێن ڕاستیەکاندا بگەڕێت، دەبێت بچێتە لای خەڵکانی پسپۆڕ وشارەزا، پزیشك نەخۆشی دەدۆزێتەوە ودەرمان وچارەسەری گونجاوی بۆ دیاری دەکات. بۆیە وازهێنان لەم بەناو ڕەخنە ڕووخێنەر ومایەپووچ وساختەکاریانە، کارێکی ژیرانەیە، وگەڕان وگەڕانەوەیە بۆ ڕاستیەکان، جا ئەگەر کەسێك چاوی ڕاستی نابینێت! یان نازانێ ڕاستی چییە! یان خۆی گێل دەکات! ئەوە خۆی بەرپرسیارە، ئەگینا وەك وتم چەواشەکاریش تا ماوەیەکە. (وەرگێڕ)

# بەشی دووەم

## شایەتی دانی ئافرەتی موسوڵمان و پەرچ دانەوەی گومانێك لە بارەیەوە

وشەی (شهادة) لە زمانەوانیدا بەم چەند واتایە هاتووە: هەواڵی بێ گومان، ئامادە بوون وبینین وئاشکرایی، سوێن خواردن، دان پیانان، وشەی شایەتومان، مردن لە ڕێگەی خوا.

لە زاراوەی فیقهیدا، زانایانی فیقی ئیسلامی ئەم وشەیان بەکار هێناوە لە (چەند مانایەکدا وەك):

١. هەواڵدان بەوەی کە مافی کەسێکت لەسەرە.
٢. کوژران ومردن لە ڕێگەی خوا.
٣. سوێند خواردن، وەك لە مەسەلەی (لعان)دا.(١)
٤. هەروەها زانایان ئەم وشەیان بەکار هێناوە بۆ: هەواڵ دان بە مافی کەسێك لەسەر کەسێکی تر لە دانیشتنەکانی دادگادا. کە ئەمەیان بابەتی باسەکەی ئێمەیە.

جا زانایان لە چۆنێتی پێناسە کردنی ئەم جۆرە شایەتیەدا ناکۆکن، بەم شێوەیەی خوارەوە:

---

(١) ئاماژەیە بە فەرموودەی خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا کە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ النور (٦، ٧، ٨، ٩) (وەرگێڕ)

- **(الكمال)[1] کە زانایەکی حەنەفی مەزهەبە، پێناسەی شایەتی بەم شێوەیە کردووە: هەواڵ دانی کەسێکی ڕاستگۆیە بۆ چەسپاندنی مافێك بە لەفزی شایەتی، لە دانیشتنی دادگادا.**
- **(الدردیر)[2] کە زانایەکی مالیکی مەزهەبە، پێناسەی کردووە بەوەی کە: هەواڵ دانە بە دادوەر بەپێی زانیاری، تاوەکو ئەویش بەپێی ئەو هەواڵ دانە بڕیاری خۆی بدات.**
- **(الجمل)[3] کە زانایەکی شافیعی مەزهەبە، پێناسەی کردووە بەوەی کە: هەواڵ دانە بە بوونی مافی کەسێك لەسەر کەسێکی تر، بە لەفزی شایەتی دەدەم (أشهدُ).**

---

**(١) ناوی تەواوی** (محمد بن عبد الواحد)**ە وناسراوە بە** (ابن الهمام). **لە ساڵی (٧٩٠)ی کۆچی لەدایك بووە، چەندین کتێبی نووسیوە، لەوانە:** تحرير الأصول، وزاد الفقير، وشرح بديع النظام لابن الساعاتي، وشرح حديث كلمتان خفيفتان، **وفتح القدير للعاجز الفقير،** وفواتح الأفكار في شرح لمعات الأنوار مقدمة التسريح، والمسايرة في العقائد المنجية في الآخرة. **لە ساڵی (٨٦١) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە:** هدية العارفين للباباني/ ١/ ٥٥٧. **(وەرگێڕ)**

**(٢) ناوی تەواوی** (أحمد في مسنده بن محمد بن أحمد في مسنده بن أبي حامد العدوي أبو بركات المصري الأزهري المالكي)**یە وناسراوە بە** (الدردير). **لە ساڵی (١١٢٧)ی کۆچی لە دایك بووە، چەندین نووسراوی هەیە، لەوانە:** أقرب المسالك إلى مذهب مالك في شرح مختصر الشيخ خليل، وتحفة الإخوان في آداب أهل العرفان، والتوجه الاسنى بنظم أسماء الله الحسنى، **لە ساڵی (١٢٠١) کۆچی دوایی کردووە.. بڕوانە:** هدية العارفين/ ١/ ٩٧. **(وەرگێڕ)**

**(٣) ناوی تەواوی** (سليمان بن عمر بن منصور العجيلي المصري الازهري الشافعي)**ە وناسراوە بە:** (الجمل)، **چەندین نوسراوی هەیە، لەوانە:** حاشية على شرح الرملي لمنهاج النووي، وحاشية على متن الهمزية لابن حجر الهيتمي، وشرح قصيدة بانت سعاد لكعب بن زبير، والفتوحات الأحمدية بالمنح المحمدية لشرح الهمزية، والفتوحات بتوضيح تفسير الجلالين لدقائق الخفيات، وفتوحات الوهاب بتوضيح شرح منهج الطلاب، والمنح الإلهيات بشرح دلائل الخيرات، **لە ساڵی (١٢٠٤)ی کۆچی وەفاتی کردووە.. بڕوانە:** هدية العارفين/ ١/ ٢١٢. **(وەرگێڕ)**

- (الشيباني)[1] كە زانایەكی حەنبەلی مەزهەبە، پێناسەی كردووە بەوەی كە: هەواڵ دانە بەوەی كە زانیاریت پێی هەیە بە لەفزی شایەتی دەدەم (أشْهَدُ، شَهِدْتُ)

ناونانی ئەم جۆرە هەواڵ دانە بە لەفزی (شهادة) ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە ئەم جۆرە شایەتیە لە بینینی دڵنیاییەوە وەرگیراوە، چونكە ئەو كەسەی كە شایەتی دەدات، هەواڵ لە شتێكەوە دەدات كە خۆی بینیویەتی، كە ئەمەش یەكێكە لەو بەڵگانەی كە داوای دادگایی پێ دەسەلمێنرێت.

ئەوەی كە پەیوەندی بەم باسی شایەتی دانەوە هەیە، ئەو گومانەی دووەمە كە كەسانی تر هەر لەسەر زمانیانە وچەند بارەی دەكەنەوە، بە هەوڵی ئەوەی كە شەریعەتی ئیسلام تۆمەتبار بكەن بەوەی كە گوایە ئافرەتی بە كەم تەماشا كردووە، وستەمی لێ كردووە، وەك هەموو جارێك دەڵێن ودەیڵێنەوە: ((ئیسلام ستەمی كردووە لە ئافرەت، كە شایەتی دانی ئافرەتێكی بە نیوەی شایەتی دانی پیاوێك داناوە)).

سەرەتا دەبێت ئەوە بزانین كە شایەتی دان ئەرك وبەرپرسیارێتیە، كاتێك كە خوای گەورە ئەم شایەتی دانەی لەسەر ئافرەت سووك كردووە، ئەمە مانای وایە كە ڕێزی لێ ناوە، نەك بە پێچەوانەوە، هەروەها پێویستە ئەوەش بزانین كە ئەو مەرجانەی كە دەبێت لە شایەتی داندا ڕەچاو بكرێن، ناگەڕێنەوە بۆ وەسفی نێرینەیی ومێیینەیی كەسی شایەتی دەر، بەڵكو دەگەڕێنەوە بۆ دوو شت:

١. دادپەروەری وكارامەیی وبیر تیژی ولێهاتوویی شایەتەكە.

---

(١) ناوی تەواوی (عبد القادر بن عمر بن عبد القادر بن عمر ابن أبي تغلب الشيباني الدمشقي الحنبلي)یە، لە ساڵی (١٠٥٢)ی كۆچی لە دایك بووە، یەكێك لە نووسراوەكانی بریتیە لە (شرح دليل الطالب) لە فیقهی حەنبەلیدا، لە ساڵی (١١٣٥) كۆچی دوایی كردووە.. بڕوانە: هدية العارفين/ ١/ ٣٢١. (وەرگێڕ)

٢. بوونی پەیوەندیەکی وەها لە نێوان شایەتەکەو ئەو ڕووداوەی کە شایەتیەکەی بۆ دەدات، کە وا بکات ئەم شایەتە ئاگای لەو ڕووداوە هەبێت وبەو پێیەش ئەو شایەتیەی بۆ بدات.

ئەوەش شتێکی زانراوە کە ئەگەر دادوەر زانی شایەتەکە ئەم جۆرە سیفەتانەی تێدایە (واتە: هەست ناسکی وسۆزداری)، ئەوا شایەتی دانەکەی لێ وەرناگیرێت، چونکە ئەم سیفەتانە بەلگەن لەسەر ئەوەی کە پەیوەندی ئەو شایەتە بە مەسەلە تاوانییەکان، وتوانای ئەو کەسە لەسەر بینین وئاگا لێبوونی ئەو تاوانانە لاوازە یان هەر بوونی نییە، ئەمەش وا دەکات کە ئەو کەسە لەو مەسئەلانەدا ئەهلیەتی شایەتی دان لەدەست بدات.

## ئەمانەی خوارەوەش هەندێك لەو ڕاستیانەن کە پێویستە لە مەسەلەی شایەتی داندا بیانزانین:

- شایەتی دانی مێیینە بە تەنها وەردەگیرێت لە بینینی مانگی ڕەمەزاندا، بەوێنەی وەرگرتنی شەتیدانی پیاوە لەو بوارەدا.
- شایەتی دانی مێیینە بە وێنەی شایەتی دانی نێرینەیە، لە بابەتی مولاعەنەدا.[1]
- شایەتی دانی مێیینە پێی وەرگیراوە لەو بابەتانەی کە تایبەتمەندن بە ئافرەتانەوە. (ابن قدامة) لە (مغني)دا دەفەرموێت: ((شایەتی دانی مێیینەی دادپەروەر وەردەگیرێت لەو شتانەی کە پیاوان ئاگایان لێی نابێت، وەك: شیرپێدان ومندالّ بوون، وسووڕی مانگانە، وماوەی (عدة)، وبابەتە

---

(١) ئاماژەیە بەو مەسەلەیەی کە خوای گەورە لەم چەند ئایەتەی سوورەتی نووردا باسی کردوون، کە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾

هاوشێوەکانی تریش. پێ نازانین کە لە نێوان زانایاندا ناکۆکی هەبێت لە وەرگرتنی شایەتی ئافرەتان بە تەنها لەم بابەتانەدا))[1] ئەوجا هەر لە پاش ئەم فەرموودەیە زیاتر بابەتەکە ڕوون دەکاتەوە، ودەفەرموێت: شایەتی مێیینەکان بە تەنها وەردەگیرێت لە پێنج شتدا:

١. منداڵ بوون.
٢. دەنگ لێوە هاتنی کۆرپەی تازە لەدایك بوو (الاستهلال).
٣. شیر پێدان.
٤. ئەو عەیب ونەنگیانەی کە لەژێر پۆشاك داپۆشراون (واتە: لە خەڵکی شاراوەن)، وەك بەربەست بوونی شوێنی زاوزێ وجووت بوونیان بە پارچە گۆشتێك (الرتق)، یان ئێسقانێك (القرن)، مەسەلەی کچێتی (البكارة)، وبێوەژنی (الثيوبة)، وبەڵەکی (البرص).
٥. تەواو بوون وکۆتایی هاتنی ماوەی (عدة)

- شایەتی دانی تەنها یەك مێیینە وەردەگیرێت. ئیبنو قودامە فەرموویەتی: ((هەر جێگەیەك کە تەنها شایەتی مێیینەی تێدا وەربگیرێت، ئەوا شایەتی تەنها یەك مێیینەشی تێدا وەردەگیرێت)).[2]

لە فەرموودەیەکی پێغەمبەریشدا هاتووە کە: عوقبەی کوڕی حارث پرسیاری کرد لە پێغەمبەر، ووتی: من ژنێکم مارە کردووە. دواتر کەنیزەکێکی ڕەش پێست هات ووتی: من شیرم داوە بە هەردووکیان (واتە عوقبەش وژنەکەشی). ئیتر پێغەمبەریش فەرمانی دا کە لە ژنەکەی جیا ببێتەوە.

---

(١) المغني لابن قدامة/ كتاب الشهادات/ تقبل شهادة امرأة عدل فيما لا يطلع عليه الرجال/ بەرگی/ ١٢/ لاپەڕە/ ١٦. (وەرگێڕ)
(٢)بڕوانە: المغني لابن قدامة/ كتاب الشهادات/ فيما يجوز فيه شهادة المرأة وحدها وفيما لو شهد رجل بذلك/ بەرگی/ ١٢/ لاپەڕە/ ١٧. (وەرگێڕ)

ئەویش وتی: ئەو کەنیزەکە درۆ دەکات. پێغەمبەریش فەرمووی: ((وازی لێ بێنە)).[1]

جا (ابن القيم) لەسەر ئەم فەرموودەیە وتوویەتی: ((لەم فەرموودەیەوە دەردەکەوێت کە شایەتی دانی یەك مێیینەش پێی وەردەگیرێت، باوەکو کەنیزەکیش بێت، وشایەتیەکەشی لەسەر کار وکردەوەیەکی خۆی بێت)).[2]

هەروەها (معروف الدواليبي)ش وتەیەکی جوانی لەسەر ئەم فەرموودەیە هەیە، کە دەڵێت: ((شەریعەتی ئیسلام لە مەسەلە وبابەتە ماڵی وداراییەکاندا بە شێوەیەکی ڕەها بۆ ئەوە دەچێت کە شایەتی دان بەهێز وبتەو بێت، بەوەی کە لەگەڵ شایەتێکی پیاو دەبێت پیاوێکی تریش شایەتی بدات، تاوەکو شایەتی دانەکە جێگەی گومان نەبێت، ولە تۆمەتبار کردن دوور بێت، هیچ کەسێکیش لەم جێگە ولەم مەسئەلانەدا وەهای دانەناوە کە هیچ جۆرە بێ ڕێزیەکی بۆ پیاوی (شایەتی) یەکەم تێدا بێت، چونکە وەك وتمان: شایەتی پیاوی دووەم تەنها بۆ بتەو کردنی شایەتیەکەیە وزیاتریش زامنی پاراستنی مافی کەسەکانە، سەرەڕای ئەوەش، کە شایەتی دانی تەنها یەك پیاو وەرنەگیراوە هەتاوەکو باوەکو لە کەم نرخ ترین مەسەلەی ماڵی ودارایی بێت، بەڵام ئافرەت ئەو جیاوازیەی هەیە لە پیاو کە گوێ لە شایەتی دانی دەگیرێت، ئەگەر چی خۆشی بە تەنها بێت، ومەسەلەکەش لەو بابەتانە بێت کە زۆر ترسناك ترن لە شتێکی کەم نرخی ماڵی ودارایی، بەڵام پیاو وەها نییە. وەکو زانراوە لە شایەتی دانی ئافرەت لەسەر منداڵ بوون وپاشکۆکانی، وەك: نەژاد ومیرات، کەچی شایەتی دانی پیاوێك بە تەنها وەرناگیرێت لە کەم نرخ ترینی مەسەلە

---

(١) البخاري/ كتاب الشهادات/ باب شهادة الإماء والعبيد/ ٢٥١٦، وفي باب شهادة المرضعة بلفظ: امرأة سوداء/ ٤٨١٦، وكذا في: أبي داود/ كتاب الأقضية/ باب الشهادة في الرضاع/ ٣٦٠٣، و الترمذي/ الرضاع/ شهادة المرأة الواحدة في الرضاع/ ١١٥١، و النسائي/ كتاب النكاح/ الشهادة في الرضاع/ ٣٣٣٠، وأحمد في مسنده/ مسند المدنيين/ حديث عقبة بن الحرث/ ١٦١٩٣، و١٦١٩٩.

(٢) بڕوانە: أعلام الموقعين/ ١/ ٩٦. (وەرگێڕ)

ماڵیەکاندا، کە لەمەشدا بەرپەرچ دانەوەیەکی بەهێزی تێدایە بۆ ئەو کەس ولایەنانەی کە ئیسلام تۆمەتبار دەکەن بەوەی کە لە شایەتی داندا پیاوی فەزڵ داوە بەسەر ئافرەتدا)).

- لە هەندێك کاتدا دوای ئەوەی کە گوێ لە شایەتی پیاو وئافرەت دەگیرێت، بەڵام شایەتی دانی ئافرەتەکە پێش دەخرێت بەسەر شایەتی دانی پیاوەکەدا: ((هەریەکە لە ژن ومێرد بۆیان هەیە کە مارە بڕینەکەیان هەڵبووەشێننەوە، بە هۆی عەیبێکەوە کە لە کەسی بەرامبەردا دەیبینن... بەڵام ئەگەر بوو بە ناکۆکیان لە عەیبی ژنەکەدا، ئەو کاتە ژنەکە پێشانی ئافرەتێکی متمانەدار دەدرێت، ووتە وشایەتی تەنها یەك ئافرەت وەردەگیرێت، جا ئەگەر شایەتی دا لەسەر وتەی پیاوەکە (مێردەکە) ئەوە تەواوە، ئەگینا قسە قسەی ژنەکەیە))..[1]
- شایەتی دان لەگەڵ گێڕانەوەی قسە وهەواڵدا جیاوازی هەیە، خۆ دەبینین کە گێڕانەوەی قسەیەك لەلایەن یەك ئافرەتەوە پێی وەرگیراوە لە هەموو شتێکدا، هەتاوەکو لە فەرموودەکانی پێغەمبەریشدا (صلى الله عليه وسلم). ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر کە تەنها ئافرەتێك بۆی گێڕاوینەتەوە، هەمان هێزی بەبەڵگەبوونی ئەو فەرموودەیەی هەیە کە تەنها پیاوێك بۆی گێڕاوینەتەوە، هیچ کەسێکیش ڕەد وبەرپەرچی وتە وقسەی ئافرەتێکی نەداوەتەوە تەنها لەبەر ئەوەی کە ئافرەتە، مەعلوومیشە کە گواستنەوەی دەقێکی ئاینی کە بڕیارێکی شەرعی وفیقهی لێ وەردەگیرێت، زۆر ترسناك ترە لەوەی کە بڕیارێکی دادگایی لەسەر دەربچێت. (شەوکانی) فەرموویەتی: ((لە هیچکام لە زانایانەوە نەگێڕاوەتەوە کە بەرپەرچی هەواڵێکیان دابێتەوە، کە ئافرەتێك گێڕاوبێتیەوە، تەنها لەبەر ئەوەی کە

---

(١) بڕوانە: المغني لابن قدامة/ كتاب النكاح/ مسألة حكم ما لو عقد المحرم نكاحا/ ٧/ ٥٧٩. (وەرگێڕ)

ئافرەتە، زۆرێك لە سونەت وفەرمودەكانی پێغەمبەریش هەن كە گەیشتوە بەم ئومەتە لە یەكێك لەو ئافرەتانەی كە هاوەڵی پێغەمبەر بوون، ئەمەش هیچ كەسێك ئینكاری ناكات كە كەمترین شارەزایی وزانیاری لە بارەی فەرموودەكانی پێغەمبەرەوە هەبێت)).[1] (ابن القیم) دەفەرموێت: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەرگیز هەواڵی تەنها كەسێكی دادپەروەری رەد نەكردۆتەوە، نە لە گێڕانەوەدا ونە لە شایەتی داندا، بەڵكو هەواڵی كەسێكی دادپەروەری قبووڵ كردووە لە هەر جێگەیەكدا كە هەواڵی پێ درابێت.. شایەتیدانی كەنیزەكێكی رەشی بە تەنها لە بابەتی شیرپێداندا قبووڵ كردووە.

ئەوجا لەپاش ئەم راستیانە، دەبینین كە سەرچاوەی ئەو گومانەی كە ئەو كەسانەی دەیوروورژێنن، ووەهای دادەنێن كە ئیسلام لە كەسایەتی ئافرەتی كەم كردووەتەوە وهێناویەتە خوارەوە، بەوەی كە شایەتی دانی ئەوی بە نیوەی شایەتی دانی پیاوێك داناوە، بریتیە لە (ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز كە دەفەرموێت): ﴿وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ فَرَجُلٞ وَٱمۡرَأَتَانِ مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰۚ﴾ البقرة/ ٢٨٢. ((واتە: جگە لە نووسینەكە، دوو پیاویش لە خۆتان ـ لەو كەسانەی كە موسوڵمانن ولە شایەتیداندا راستگۆن ولە حەق لانادەن ـ بكەنە شایەت، ئەگەر دوو پیاو دەست نەكەوت، با پیاوێك ودوو ئافرەت بێت لەو كەسانەی كە خۆتان بە شایەتیدانیان رازین، تا ئەگەر شتێكیان سەبارەت بە چەند وچۆنی قەرزەكە لەبیر چوویەوە، بە بیری یەكتری بهێننەوە، وچۆنێتی قەرزەكە وەك خۆی بخەنە روو)).

---

(١) بڕوانە: نیل الأوطار/ كتاب العدد/ باب ما جاء في نفقة المبتوتة وسكناها/ ٧/ ٦٣. (وەرگێڕ)

ئەمەش تێکەڵ کردنە لە نێوان شایەتی دان (الشهادة)، شایەتی گرتن (الإشهاد) کە ئەم ئایەتە پیرۆزە باسی لێوە دەکات، چونکە شایەتی دان کە دادگا پشتی پێ دەبەستێت لە دەرخستنی ڕاستییەکان ودادپەروەریدا، کە لەسەر بەڵگە ڕاوەستاوە، ولە ناوجەرگەی داوای لایەنە ناکۆکەکانەوە بە پوختی وەردەگیرێت، ئەو شایەتی دانە نێرینەیی ومێیینەیی ناکرێت بە پێوەر بۆ ڕاستی ودرۆیی، تاوەکو دواتر قەبووڵ بکرێت یان ڕەفز بکرێتەوە، بەڵکو پێوەری وەرگرتنی ئەو شایەتیە بریتییە لە: دڵ ئارامی ودڵنیابوونی دادوەر بۆ ڕاستێتی شایەتیەکە، ئیتر بێ گوێدانە ئەوەی کە کەسی شایەت چی ڕەگەزێکە، نێرینەیە یان مێیینە، بێ گوێدانە ژمارەی شایەتەکان.

کەواتە دادوەر ئەگەر دڵنیابوو و ویژدانی ئاسوودە بوو بەوەی کە بەڵگە وشایەتیەکە درووستە ولە جێی خۆیدایە، ئەو کاتە بۆی هەیە کە پشت بە شایەتی دانی دوو پیاو، یان دوو ژن، یان پیاوێك وژنێك، یان پیاوێك ودوو ژن، یان ژنێك ودوو پیاو، یان تەنها یەك پیاو، یان تەنها یەك ژن ببەستێت.. ئیتر نێرینەیی ومێیینەیی کەسی شایەتی دەر هیچ کاریگەری لەسەر شایەتیدانەکە نابێت، کە دادگا بڕیاری پێدەدات بەپێی ئەو زانیاری وڕوونکردنەوانەی کە دەیخاتە ڕوو.

سەبارەت بە ئایەتەکەش، - وەك ئاماژەمان پێدا - باس لە شتێکی تر دەکات لە بەردەم دادوەردا، نەوەك شایەتی دان، چونکە باس لە شایەتی گرتن (یان شایەت لەسەر هێنان) دەکات، کە کەسێکی خاوەن قەرز دەیهێنێت بۆ دڵنیابوون لە پاراستنی قەرزەکەی، نەوەك باس لە شایەتی دان، کە دادوەر پشتی پێ دەبەسێت لە بڕیاردانەکەیدا لە نێوان دوو لایەنە ناکۆکەکەدا.. کەواتە ئەو ئایەتە ڕوو لە کەسی خاوەن قەرز دەکات، نەوەك دادوەر کە بڕیار لە ناکۆکیەکە دەدات.. بەڵکو ئەم ئایەتە ڕوو لە هەموو خاوەن قەرز ومافێك ناکات، ئەو مەرجانەشی تێدا نییە کە لە تەواوی حاڵەتەکانی قەرزاری بەمەرج

گیراون سەبارەت بە پلەکانی شایەتی گرتن وژمارەی شایەتەکان. بەڵکو تەنها ئامۆژگاری ورێنموویی خاوەن قەرزێکی تایبەتی دەکات، لە هەندێك حاڵەتی تایبەتی قەرزاری، کە (مُلابَسات)ی تایبەتی هەیە، وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە.. کە قەرزێکە بۆ کاتێکی دیاری کراو.. پێویستە بنووسرێتەوە.. دەبێت شایەتەکانیش دادپەروەر بن.

هەندێك لە زانایان بە ڕاستی لەم ئایەتە تێگەیشتوون کە باس لە شایەت گرتن دەکات لە قەرزێکی تایبەتدا، نەوەك باس لە شایەتی دان.. هەروەها ئەم ئایەتە ئامۆژگاری ورێنموویی بۆ خاوەن قەرز ومافەکە تێدایە، کە لە حاڵەتێکی تایبەتیدایە، نەوەك یاسایەك بێت وڕووی پێ کرابێتە دادوەر بۆ بڕیاردان ویەکلایی کردنەوەی ناکۆکیەکان.

جا هەندێك لەو زانا شەرع زانانەی کە گەیشتوونەتە ئەم ڕاستیە، وبەم شێوەیە لە ئایەتەکە تێگەیشتوون، وبە درێژی باسیان لێوە کردووە، بریتین لە: (ابن تيمية وتلميذه ابن القيم) لە زانایانی سەدەکانی پێشوو، (محمد عبده و محمود شلتوت) لە زانا نوێیە هاوچەرخەکان.

ئەوجا سەبارەت بە بەڵگە هێنانەوە (البينة) کە دادوەر بڕیاری پێ دەردەکات، وفەرموودەیەکی پێغەمبەر بناغەی شەرعی وفیقهی بۆ داناوە، وەك دەفەرموێت: ((البينة على المدعي واليمين على المدعى عليه))[1] (واتە: بەڵگە هێنانەوە لەسەر کەسی داواکارە، سوێندیش لەسەر کەسی داوا لەسەر کراو.)، (ابن القيم) فەرموویەتی: ((بەڵگە (البينة) لە شەرعدا بە شتێك دەوترێت کە ڕاستی ڕوون بکاتەوە وئاشکرای بکات، کە ئەویش جاری وا هەیە کە چوار شایەتە، جاری واش هەیە کە سیانە، وەك لە شایەتیداندا لەسەر کەسی

---

(١) الترمذي/ الأحكام/ أن البينة على المدعي واليمين على المدعى عليه/ ١٣٤١، والدار قطني/ كتاب الوصايا/ باب خبر الواحد يوجب العمل، والبيهقي في السنن الكبرى/ كتاب الدعوى والبينات/ باب البينة على المدعى واليمين على المدعى عليه/ ٢٠٩٩٣.

(مُفلِس)دا هاتووە، جاری واش هەیە کە دوو شایەتە، یان یەك شایەت، یان یەك ئافرەت، دەشکرێت ئەو بەڵگەیە (البینة) سوێند نەخواردن بێت، دەشکرێت کە سوێند خواردن بێت، دەشکرێت کە پەنجا سوێند بێت، یان چوار سوێند، دەشکرێت کە کەسێکی شایەتی ئامادە وشارەزا بێت کە خۆی ڕووداوەکەی بە چاوی خۆی بینی بێت. کەواتە ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە فەرمووی: (البینة علی المدعي) ئەوە دەگەیەنێت کە شتێك بهێنێت کە ئەوە دەربخات کە ئەم کەسی داوا بەرزکەرەوە لە داواکەیدا ڕاست دەکات، جا ئەگەر بە هەر ڕێگەیەك دەرکەوت کە ڕاست دەکات، ئەو کاتە بڕیار دەدرێت لە بەرژەوەندی ئەو)).[1]

ئەوجا وەك چۆن بەڵگە دەکرێت بە شایەتی دانی یەك پیاو یان زیاتر بێت، هەروا دەشکرێت کە بە شایەتی دانی یەك ئافرەت بێت یان زیاتر، ئەویش بەپێی ئەو پێوەرەی کە دڵنیایی وئارامی دەدات بە ویژدان ودڵی دادوەر.

ئەوجا (ابن القیم) خۆی کەمێك[2] لەپاش ئەو وتەیەی (ابن تیمیة) دەفەرموێت: ((منیش دەڵێم: لە قورئاندا نەهاتووە کە وا بخوازێت کە بڕیار نادرێت مەگەر بە دوو شایەتی پیاو، یان بە پیاوێك ودوو ئافرەت نەبێت، بەڵکو خوای گەورە فەرمانی کردووە بە خاوەن مافەکان کە مافەکانی خۆیان بەم ژمارە (دوو پیاو، یان پیاوێك ودوو ئافرەت) بپارێزن، فەرمانی نەکردووە بە دادوەرەکان کە بەو ژمارەیە بڕیار دەربکەن، ج جای ئەوەی کە ئەمری پێ کردبن کە نابێت بەو ژمارەیە نەبێت بڕیار دەربکەن. هەر بۆیە دادوەر دەتوانێت بڕیار دەربکات بەهۆی سوێند نەخواردنەوە، یان سوێندی بەرامبەر

---

(١) الطرق الحکمیة في السیاسة الشرعیة/ ص٢٤/ ابن القیم/ مطبعة المدني – القاهرة/ تحقیق: د. محمد جمیل غازي/ عدد الأجزاء: ١.

(٢) وشەی کەمێك لێرەدا لە جێگەی خۆیدا نییە، چونکە ئەم وتەیەی (ابن القیم) لە لاپەڕە/ ١٩٨ دایە. بۆیە ئەگەر ئەو وشەیەی هەر نەهێنایە، یان بیوتایە هەر لە هەمان سەرچاوە وباسدا وتوویەتی... ئەوا باشتر بوو. (وەرگێڕ)

بدات لە برێتیدا، یان بڕیار بدات بە شایەتی دانی یەك ئافرەت، یان تەنها بە شایەتی دانی ئافرەت، کە پیاویان لەگەڵ نەبێت)).[١]

(ابن تیمیة) هۆکار وحیکمەتی ئەوەی کە (شایەتی دانی دوو ئافرەت لە بەرامبەر شایەتی دانی یەك پیاودایە) گەڕاندوویەتیەوە بۆ ئەوەی کە ئافرەت بە پێی عادەت پشوو درێژ نییە وبەرگەی ئەم دانیشتنانە وئەم جۆرە مامەڵانە ناگرێت، بەڵام ئەگەر شارەزایی ولێهاتوویی وعادات وتواناکانی خۆی پەرەپێ بدات ئەو کاتە شایەتی دانی ئەمیش هاوتا ویەکسان دەبێت لەگەڵ شایەتی دانی پیاوان، باوەکو لە مەسەلەی پاراستنی ماف وقەرزەکانیشدا بێت.. دەفەرموێت: ((گومانی تێدا نییە کە حیکمەتی ئەم دوو شایەتیە لە ئافرەتدا دەگەڕێتەوە بۆ توانا وبەرگە گرتن وپشوو درێژی ئافرەت خۆی، بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە خۆی ڕابگرێت وبتوانێت زانیاریەکان بە باشی لای خۆی بپارێزێت و بهێڵێتەوە، لەو ئافرەتانەش بێت کە متمانە بە دینداریان دەکرێت، ئەوا ئەوەی کە مەبەستە بە شایەتی دان وقسەی ئەو دێتەجێ، هەر بۆیە لە چەند جێگەیەکدا شایەتی دانی تەنها ئافرەتێك قەبووڵ دەکرێت، بەلای ڕاست ترینی دوو بۆچوونەکەشەوە دەکرێت کە بڕیار دەر بکرێت بە شایەتی دانی دوو ئافرەت لەگەڵ سوێند خواردنی کەسی داواکار، کە ئەمە فەرموودەی ئیمامی مالیکە ویەکێکیشە لە دوو بۆچوونەکە لە مەزهەبی ئیمامی ئەحمەددا.))[٢]

هەروەها (محمد عبده)ش هەمان ئەم واتایەی باس کردووە، کاتێك کە ئەم فەزڵ دانەی شایەتی دانی پیاوی بەسەر شایەتی دانی ئافرەت _ کە لە ئایەتەکەدا هاتبوو _ دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی کە ئافرەتان لەو مێژوەدا دوور بوون لە ئامادە بوون لەو جێگانەی کە مامەڵەی بازرگانیان تێدا دەکرا، هەر

---

(١) الطرق الحكمية في السياسة الشرعية/ ص١٩٨.

(٢) إعلام الموقعين عن رب العالمين، ابن القيم/ ١/ ٩٥/ تحقيق: طه عبد الرءوف سعد/ دار الجيل بيروت - ١٩٧٣.

بۆیە دووریش بوون لە تەحەمول کردن وپشوو گرتن لەو بوارانەدا، کە ئەمەش واقیعێکی مێژووییە، وەل کەچ دەبێت بۆ بەرەو پێش چوون وگۆڕان، وبەشێك نییە لە سروشت وتەبیعەتی ڕەگەزی ئافرەتان، وبە درێژایی مێژووش هەر لەگەڵیاندا بمێنێتەوە[1]، وتوویەتی: ((زانایانی تەفسیری قورئان باسیان لەم مەسەلەیە کردووە، وهۆکارەکەشیان گەڕاندوەتەوە بۆ مەزاج وتوانای کەسەکە، وفەرموویانە: مەزاجی ئافرەت ساردی ڕووی تێ دەکات، ئەویش لە بیر چوونەوە دێت بە شوێنیدا، کە ئەمەش هەموو کات نایەتە دی ووەها نابێت. بۆیە (دەبێت بوترێت کە) هۆی درووست وڕاستەقینە ئەوەیە کە: نیشی ئافرەت نییە کە خۆی بە مامەڵەی ماڵی وهاووێنەکانی وەك شت بە شت دان خەریك بکات، هەر بۆیە بیری لاوازە وشتی کەم لە بیردا دەمێنێت (لەم مەسئەلانەدا)، بەڵام لە کاروباری ناو ماڵدا کە نیشی خۆیەتی، وەها نییە، بەڵکو بیری لە بیری پیاو بەهێز ترە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە: سرووشتی هەموو مرۆڤێك، نێرینە بێت یان مێیینە، ئەوەیە کە زیاتر بیری بە هێزە بۆ ئەو کار

---

(١) ئەم بۆچوونەی (محمد عبده) وا دەگەیەنێت کە ئەگەر داب ونەریتی خەڵك گۆڕا، بە جۆرێك کە ئافرەتان زیاتر خەریك دەبوون بە کاروباری بازرگا نییەوە، ئەمە وا دەکات کە شایەتی دانی ئافرەت لەم مەسئەلانەدا هاوتا ویەکسان بێت بە شایەتی دانی پیاو!! بەڵام دکتۆر (محمد سعيد رمضان البوطي) لە کتێبێکیدا بە ناونیشانی (المرأة بين طغيان النظام الغربي ولطائف التشريع الرباني/ ل١٥٢) لە تەحقیقێکی ورد ودرووستدا دەفەرموێت: گۆڕان وبەرەوپێش چوونی داب ونەریتی کۆمەڵایەتی کاتێك دەبێت بە هۆی گۆڕانی بڕیاری شەرعی، کە لەسەر بنەمایەکی درووست وگونجاو بێت لەگەڵ ڕێساکانی شەریعەتی ئیسلامیدا، ئەگینا درووست نییە ونابێت، وە لەم مەسەلەشدا کە ئێمە باسی لێوە دەکەین، دەبێت ڕەوا بێت کە ئافرەتان بە گشتی خەریك بن بە کاروباری بازرگانی ومامەڵەی ماڵی ودارایییەوە، بەڵام ئەم کارە خراپەی زۆری لێ پەیدا دەبێت، یەکێك لەوانە ئەوەیە کە مەترسی زۆری لێ دەکەوێتەوە بۆ سەر ئافرەتان بە گشتی، وە هەم بۆ پیاوانیش زیانی هەیە، چونکە مەحرووم دەبن لەو ویست وئارەزوانەی کە چاوەڕوانی دەکەن لە هاوسەر وخێزانەکانیان. بۆیە پێی وایە کە لەم مەسەلەیەدا گۆڕینی داب ونەریت کاریگەری لەسەر گۆڕینی حوکمە شەرعیەکە نابێت. (وەرگێڕ)

وبارانەی کە مەبەستێتی وگرنگە بە لایەوە، وئەو کارانەی کە زیاتر خۆی پێیانەوە خەریك دەبێت.))[١]

هەروەها شێخ (محمود شلتوت)یش پاش ئەوەی کە بە باشی لە فەتوا وتێگەیشتنەکانی (ابن تيمية وابن القيم ومحمد عبده) حاڵی بووە، ئەویش هەر لەگەڵ ئەم ڕێگە وڕێچکەیەدا ڕۆیشتوە، وزانیاریەکی تریشی بۆ ئەم ڕێگەیە زیاد کردووە، لە کاتێکدا کە سەرنجی ڕاکێشاوین بۆ ئەوەی کە شایەتی دانی پیاو وئافرەت لە مەسەلەی (لعان)دا یەکسانن، سەبارەت بە یەکسانبوونی شایەتی دانی ئافرەت (لەگەڵ شایەتی دانی پیاو)، وچۆنێتی بوونەبەڵگەی ئەم شایەتی دانە لەسەر ئەوەی کە ئافرەت کەسایەتی وئەهلیەتێکی تەواوی هەیە، دەڵێت: ((ئەمەش بە پێچەوانەی ئەو بیرە هەڵە وچەوتەوە کە وەهای داناوە کە هەڵوێستی ئیسلام لەم مەسەلەدا لە مرۆڤایەتی وکەسایەتی ئافرەتی هێناوەتە خوارەوە. پاشان دەڵێت: ئەوەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَٱمْرَأَتَانِ﴾ بۆ ئەو جێگەیە نەهاتووە کە باس لە شایەتی دانی بەردەم دادوەر دەکات، کە دادوەر لەسەر ئەو شایەتی دانە بڕیاری خۆی دەدات، بەڵکو بۆ ئەوە هاتووە کە ڕێنموویی کەس ولایەنەکان بکات بۆ یەکێك لەو ڕێگەیانەی کە بۆ دڵنیابوون ودڵئارامی خۆیان پێویستە سەبارەت بەو مافانەی کە لە کاتی هەڵسووکەوتیاندا لەگەڵ یەکتریدا پەیدا دەبێت. کەواتە لە ئایەتەکەدا جێگەکە جێگەی دڵنیابوونە لەسەر مافەکان، نەوەك بڕیاردان بە مافەکان. ئایەتەکەش ڕێنموویی دەکات بۆ باشترین جۆر وڕێگاکانی دڵنیایی کە ئارامی وئاسوودەیی دەداتە دڵ وڕۆحی کەسە پەیوەندی دارەکان لەسەر مافەکانیان، ئەمەش مانای وا نییە کە شایەتی دانی یەك ئافرەت، یان شایەتی دانی ئافرەتان بە تەنها هیچ مافێکی پێ ناچەسپێت، ودادوەریش بڕیاری پێ

(١) الأعمال الكاملة للإمام محمد عبده/ ٤/ ٧٣٢. دراسة وتحقيق: د. محمد عمارة. طبعة القاهرة.

نادات، چونکە ئەوپەڕی ئەوەی کە دادگا داوای دەکات بریتیە لە هێنانی بەڵگە (البینة).

زانای شارەزا (ابن القیم) تەحقیقی ئەوەی کردووە کە وشەی بەڵگە (البینة) لە شەرعدا ماناکەی گشتی ترە لە مانای شایەتی دان، هەموو ئەو شتانەی کە ڕاستیەکانیان پێ ڕوون ببێتەوە وئاشکرا ببن، ئەوە بە بەڵگە دادەنرێن ودادوەریش بە هۆیانەوە بڕیاری خۆی دەردەکات. جا یەکێك لەو بەڵگانە ئەوەیە کە: دادوەر بڕیار دەدات بە ئەو قەرینانەی کە ڕاستن وبی گومانن (القرائن القطعیة)، هەروەها بڕیار دەدات بە شایەتی دانی کەسی ناموسوڵمانیش، هەرکاتێك کە متمانەی پێی هەبوو، دڵی لەسەری ڕازی وئارام بوو. هەروەها دانانی شایەتی دانی دوو ئافرەت بە شایەتی دانی یەك پیاو بۆ دڵنیا بوون، لەبەر ئەوە نییە کە بیر وهۆشی لاوازە، کە ئەگەر وەها بێت، ئەوا دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە کەسایەتیشدا هەر نوقسان بێت، کە ئەمیش یەکێکە لە شوێنەوارەکانی لاوازی هزر وبیری کەسەکان، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە ئافرەت، وەك (محمد عبده) دەڵێت: ((خەریك بوون بە مامەڵە کردن وکاروباری بازرگانی ئیشی ئافرەت نییە، بۆیە دەکرێت کە بیر وهۆشی لەبارەیانەوە لاواز وبێ هێز بێت، بەڵام لە کاروباری ماڵەوەدا کە ئیشی خۆیەتی، وەها نییە، بەڵکو لەو کارانەدا بیر وهەستی زۆر لە پیاوان بەهێز ترە، بەشێوەیەکی گشتی سرووشتی مرۆڤەکان وەهایە کە بیر وهۆشیان بەهێزترە لەو کاروبارانەی کە پێیانەوە خەریکن وەمەبەستیانە، وزیاتر سەرقاڵی کردوون)).

بۆیە ئایەتەکەش هەر بەو شێوەیە هاتووە کە لە ئیش وکاری ئافرەتاندا باوە، کە تاوەکو ئێستاش زۆرینەی ئافرەتان هەر بەو شێوەیەن، ناچنە ئەو جێگەیانەی کە مامەڵەی قەرزیان تێدا ئەنجام دەدرێت، خۆشیان بە بازاڕەکانی کڕین وفرۆشتنەوە خەریك ناکەن، بەڵکو خەریك بوونی هەندێك ئافرەتیش

بەو جۆرە کارانەوە پێچەوانەی ئەم ڕێسا گشتیە نییە کە سرووشتی ژیانی ئافرەت خۆی وا دەخوازێت.))[١]

ئەوجا تا ئەم سنوورە لە هێنانی وتە وبۆچوونی زانایان ولێکۆڵینەوەی خۆمان دەکرێت توانیبێتمان کە بەرپەرچ ورەدی ئەو کەسانەمان دابێتەوە کە ویستوویانە تۆمەت بلکێنن بەم شەریعەتە حەکیمەوە، ئێمە وەها دەبینین کە لەم تۆمەتبارکردنانەی مەسەلە وباسەکانی ئەم شەریعەتە ڕاستەی ئێمە، کەسانی بەرامبەر لێیان تێك چووە وشتەکان تێکەڵ دەکەن ودەسیان لێ وەشێنراوە، بە جۆرێکی وەها کە دەبێتە بەڵگە بۆ دووپات کردنەوەی ئەوەی کە ئەم شەریعەتە زۆر بەهێز وبتەوە، لە لایەن خوایەکی شارەزا وکاربەجێوە هاتووە. وسووپاس بۆ پەروەردگاری بوونەوەران.

---

(١) الإسلام عقيدة وشريعة/ ٢٣٩ — ٢٤١. طبعة القاهرة، سنة (١٤٠٠) هجرية، سنة (١٩٨٠) ميلادية. وە زانای پایە بەرز دکتۆر (محمد سعيد رمضان البوطي) لە پەراوێزی باسی شایەتی داندا دەفەرموێت: یەکێك لە گەورە ترین بەڵگەکانی ئەم قسەیە ئەوەیە کە: من خۆم نزیکەی سێساڵێك لەمەوبەر سەردانی بۆرصەی شاری نیۆرکم کرد.. وە لە کاتی تێفکرینم لەو ژاوەژاو وقەربالغی ودەمار گرژیە زۆرەی کە هەبوو، هەر وەك ئارەزوویەك گەڕام بە شوێن تەنها ئافرەتێکی هیلاك لەو کاروبارەی کە ئەو پیاوانەی ماندوو وشەکەت کردووە، بەڵام چاوم یەك ئافرەتیشی نەبینی.. بۆیە ئەمە بەڵگەی ئەو قسانەیە کە کردمان. بڕوانە: المرأة بين طغيان النظام الغربي ولطائف التشريع الرباني/ ١٤٩. (وەرگێڕ)

# بەشی سێیەم

# چەند ژنی وحەقیقەتەکەی

وەك ڕاست کردنەوەی مانا وچەمکەکان، ودەرخستن وڕاوەستاندنی ڕاستیەکان، پێویستە لەسەرمان کە بزانین: ئیسلام هاتووە سنووری بۆ فرە ژنی داناوە، نەوەك فرە ژنی هێنا بێت، وەك کەسانی تر وا گومان دەبەن. ئەوەتا لە سالیمەوە ئەویش لە باوکیەوە بۆمان دەگێڕێتەوە کە غەیەلانی کوڕی سەلەمەی هۆزی ئەقیف موسوڵمان بوو، ولەو کاتەدا دە ژنی هەبوو، و پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو: ((**اختر منهن أربعا**))[1] واتە: چوار لەو ژنانەت هەڵبژێرە.

لەم فەرموودەیەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئیسلام سنووری بۆ فرەژنی داناوە، لە بەرامبەریشدا هیچ فەرمانێك نەهاتووە بۆ کەسێك کە یەك ژنی هەیە باوەکو ژنێکی تر بهێنێت، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە فرەژنی خۆی لە خۆیدا مەبەست نییە، بەڵکو هێنانی ژنێکی تر لە لایەن پیاوەوە لەبەر چەندین هۆکار وبەرژەوەندی گشتییە.

لە قورئانی پیرۆزدا باسی فرەژنی نەکراوە بە جۆرێك کە باسی هۆکارەکانی نەکرێت، ئەوەتە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ النساء/ ٣. ((واتە: ـ ئەگەر مافی سەرپەرشتیاری کچێکتان هەبوو -

---

(١) أحمد في مسنده/ مسند المكثرين من الصحابة/ مسند عبد الله بن عمر بن الخطاب/ ٤٦٠٩، وابن حبان/ كتاب النكاح/ باب نكاح الكفار/ ٤١٥٦، والطبراني في المعجم الكبير/ باب العين/ عبد الله بن عمر بن الخطاب/ ١٣٢٢١.

ترسی ئەوەتان هەبوو کە مارەیی تەواوی بۆ بڕیار نەدەن، ئەوە نابێت مارەی بکەن لە خۆتان و، واز لەو کچە بێنن وبچن ئافرەتێکی تر پەیدا بکەن، دەتوانن ژنێك تا چوار ژن مارە بکەن، بەو مەرجەی بە عەدالەتەوە لەگەڵیاندا بجوڵێنەوە ووەك یەك تەماشایان بکەن. بەلاَم ئەگەر ترسی ئەوەتان هەبوو کە نەتوانن بە عەدالەتەوە لەگەڵیاندا بجوڵێنەوە، لەلایەنی ڕابواردن و گوزەرانیانەوە، لەو کاتەدا نابێت لە ژنێك زیاتر بهێنن، بەلاَم دەتوانن لەو کەنیزەکانەی بە کۆیلایەتی دەکەونە بەردەستتان، پەیوەندیتان هەبێت، جا یەکێك بێت یان زیاتر، ئەمە نزیکترین وباشترین ڕێگایە بۆ ئەوەی کە خۆتان لە ستەم دوور بخەنەوە، ودووچاری خراپە وناخۆشی نەبن)).

حا ئەوانەی کە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەیان کردووە یان لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردووە وەکو نیزامێکی مرۆیی کۆمەلاَیەتی، تەفسیریان کردووە دوور لەو هۆکارە سەرەکیەی کە ئایەتەکەی بۆ دابەزیوە، کە ئەویش بوونی هەتییو وبێوەژنانە، چونکە لە ئایەتەکەدا باسی فرە ژنی لەگەڵ هەتیواندا هاتووە، ئەوانە هەستاون بە تەنها ئەو بەشەی ئایەتەکەیان هێناوە کە دەفەرموێت: ﴿فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ﴾، ئیتر بەبێ بەشی پێشووی، کە بە شێوەی مەرج داڕێژراوە وهاتووە، وەك دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَٰمَىٰ﴾، هەروەها بەبێ بەشی دواتریش، کە کۆتێکی داناوە بۆ ڕەوایی و درووستی فرەژنی، کە دەبێت پیاوەکە دادپەروەر بێت لە نێوانیاندا، وەك دەفەرموێت: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ فَوَٰحِدَةً﴾.

ئەوجا هەر کەسێك کە ڕوو لە قورئانی پیرۆز بکات، نابینێت کە بانگەشەیەکی کراوەی ڕاشکاوی تێدا بێت بۆ فرەژنی، بەبێ ئەو کۆتانەی کە ئامازەمان پێدان. هەر کەسێکیش کە ڕوو لە فەرموودەکانی پێغەمبەریش بکات، ئەبینێت کە ئاینی ئیسلام فرە ژنی لە چوار ژن زیاتری یاساغ وحەرام

کردووە، جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان ئەوەی کە ئیسلام فەرمانی دابێت بە فرەژنی تاوەکو دەگاتە چوار، لە نێوان ئەوەی کە فرەژنی لە سەرووی چوارەوە یاساغ وقەدەغە کردووە.

ئەم نیزامی فرەژنییە بەر لە هاتنی ئیسلامیش هەر باو بووە لە کۆمەڵگای عەرەبیدا، هەروەها لە نێوان جوولەکە وفارسەکانیشدا، مێژوویش کە باسی پاشا ودەسەڵاتدارەکانمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە خانوو ومالی وەها فراوانیان درووست کردووە کە هەندێك جار جێگەی زیاد لە هەزار کەسی تێدا بووەتەوە، بۆ ئەوەی کە ژن وکەنیزەکەکانیانی تێدا بێت، هەندێك جاریش ئەم ژن وکەنیزەکانەیان وەك بەخشش ودیاریەك دەنارد بۆ پاشاکانی تر، وژنی تازەیان دەهێنا، وەك چۆن لە شەریعەتی جوولەکەکان وپاساکانیان _ تاوەکو ئێستاش _ فرەژنیان هەر پێ ڕەوایە، و کەچی هیچ کەسێکیش ناوێرێت بە بێ ترس باس لە بیروباوەڕ وئاین وشەریعەتەکەیان بکات.

ئەوەی کە نامۆیە ئەوەیە کە: ئەوانەی کە شەڕ دەگێڕن بە ئاینی ئیسلام لەوەدا کە ڕێگەی داوە بە پیاوێك کە لە بارودۆخێکی دیاری کراودا دەتوانێت زیاتر لە ژنێك بهێنێت، ئەوانە خۆیان دەناڵێنن بە دەست گرفتی لێك هەڵوەشانی خێزانی وبڵاو بوونەوەی خراپەکاری وداوێن پیسی، و درووستی و ڕەوایی فرە هاوەڵی وفرە دۆستی **(العشيقات او الخليلات)** بە بێ ژمارە وبە بێ سنوور. جا ئەو دۆست وهاوڕێیانە ئەو مافانەی کە ژن وهاوسەر هەیەتی، ئەوان نیانە، سەرەڕای ئەوەی کە ناپاکیە بەرامبەر بە هاوسەر وخێزان، وپێشێل کردنی مافەکانی، وپشت گوێ خستن وحیساب نەکردنە بۆ خۆی ومنداڵەکانی. جا ئەو هاوڕێ ودۆستانە خۆیان دەبێت شان بدەنە ژێر پارە وکرێی لەبار بردنی سکە ناشەرعیەکانیان، یان هەر دەبێت بە بێ مێرد (وەك دایکێکی شوو نەکردوو) بمێننەوە وخزمەت وچاودێری مناڵە ناشەرعیەکەیان بکەن. جا ئەگەر بزانن: کام لەو دوو کۆمەڵە زیاتر هەست بە ئاسایش

وئاســـوودەیی دەكــەن؟! ﴿فَأَيُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِٱلْأَمْنِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ الأنعـام/٨١.
(ژنێك كە مێردەكەی چەند ژنێكی تری هەبێت، یان ئافرەتێك كە تەنها دۆست و هاوڕێی هەبێت).

ئەو فرەژنییەی كە لە ڕۆژئاوادا هەیە، هیچ چوار چێوەیەكی نییـە، چونكە فرە ژنییەكە كە ئافرەت هیچ مافێكی بۆ دەستەبەر ناكرێت، بەڵكو پیاوان وەكو كـەنیزەك مامەڵـەیان لەگەڵـدا دەكـەن، وپەیوەندیـەكی نافـەرمیان لەگەڵـدا درووست دەكـەن، وگوڵی تەمـەن وگـەنجێتیان دادەڕنـن، پاشـان لـە دڵ وژیانیـان دەیانكەنە دەرەوە، كە زۆر جار ئەم پەیوەندیـە ناشـەرعیە دەبێتـە هۆی پەیـدا بوونی چـەندەها نەخۆشـی ترسـناك، سـەرەڕای لێكەوتنـەوەی چـەندین منـداڵی ناشەرعی كە زۆر جار هیچ كەسێك هـەر دانیشیان پێـدا نانێت، ئـەوجا لەبـەر زۆری ژمارە وزۆری سەرژمێرییەكان، ئێمـە تـەنها یـەك وڵات وەكو نموونـەیـەك لە وڵاتانی ڕۆژئاوا دەهێنین وبەس، كە ئەویش با ئەمەریكا بێت، ئەوجا باوەكو ژمارەكان خۆیان بدوێن وقسە بكەن:

- لە ساڵی (١٩٨٠)ی زاینی (١,٥٥٣,٠٠٠) حاڵەتی سك لـەبار بـردن هـەبووە، كـە (٣٠٪) لـەو حاڵەتانـە لـە لایـەن ئـەو ئافرەتانـەوە بـوون كـە تەمـەنیان لـە بیسـت سـاڵ تێنەپـەڕیبوو، پۆلیسـیش وتبوویـان: ژمـارە ڕاسـتیەكە سـێ بەرامبەری ئەوەیە كە باس كراوە.
- لە ساڵی (١٩٨٢)ی زاینی (٨٠٪) ئەو ئافرەتانەی كـە مـاوەی پـانزە سـاڵ بـوو مێردیان هەبوو، تەڵاق دران.
- لــە ســاڵی (١٩٨٤)ی زاینــی (٨,٠٠٠,٠٠٠) هەشــت ملیــۆن ئــافرەت لەگــەڵ منداڵەكانیان دەژین، بەبێ هیچ یارمەتیەكی دەرەكی.
- لــە ســاڵی (١٩٨٦)ی زاینــی (٢٧٪)ی دانیشــتوان لەســەر حیسـابی ئافرەتــان دەژیان.

- لە ساڵی (١٩٨٦)ی زاینی (٦٥) حاڵەتی دەست درێژی کردنە سەر ئافرەتان هەبووە، لە هەموو (١٠,٠٠٠) هەزار ئافرەتێك.
- لە ساڵی (١٩٩٥)ی زاینی (٨٢,٠٠٠) هەزار تاوانی دەست درێژی کردنە سەر ئافرەتان هەبووە، کە (٨٠٪)ی ئەو ژمارەیە لە دەوروبەری خێزان وهاوەڵ وهاورێکاندا بووە، لە کاتێکدا کە پۆلیس دەڵێن: ژمارە ڕاستیەکە (٣٥) ئەوەندەی ئەوەیە کە باس کراوە.
- لە ساڵی (١٩٩٧)ی زاینی بە پێی وتەی ئەو کۆمەڵانەی کە پارێزگاری وداکۆکی لە مافی ئافرەت دەکەن: هەموو (٣) چرکەیەك دەست درێژی دەکرێتە سەر ئافرەتێك، لە کاتێکدا کە لایەنە فەرمیەکان بەرپەرچی ئەم وتەیان دایەوە بەوەی کە: ئەو ژمارەیە زیادەڕەوی تێدا کراوە، چونکە ژمارە ڕاستیەکە ئەوەیە کە لە هەموو (٦) چرکەیەکدا حاڵەتێکی دەست درێژی کردنە سەر ئافرەتێك هەبووە.
- (٧٤٪)ی بەساڵاچوە هەژارەکان ئافرەتن، و(٨٥٪)ی ئەو ئافرەتانەش بە تەنها ژیان بەسەر دەبەن، وهیچ کەسێکیش کۆمەکی وهاوکارییان ناکات.
- لە ساڵی (١٩٧٩ ـ ١٩٨٥): نەشتەرگەری نەزۆك کردنی ئافرەتان کراوە بۆ ئەو ئافرەتانەی کە لە ئەمەریکای لاتی نییەوە هاتوون بۆ ولایەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بۆ ئەو ئافرەتانەی کە لە ڕەگەز وئەصڵدا لە هیندیە سوورەکانن، ئەویش بەبێ زانیاری وئاگادار بوونی خۆیان.
- لە ساڵی (١٩٨٠ _ ١٩٩٠)ی زاینی: لە ئەمەریکادا نزیکەی (١,٠٠٠,٠٠٠) یەك ملیۆن ئافرەت کاری لەش فرۆشیان دەکرد.
- لە ساڵی (١٩٩٥): دەسهاتی دامەزراوەکانی بەدڕەوشتی ولەش فرۆشی، ودەزگاکانی ڕاگەیاندنیان گەیشتە (٢٥٠٠) ملیۆن دۆلار.[(١)]

---

(١) ڕاپۆرتی ساڵانە بە ناوی (قاموس المرأة) کە لە پەیمانگای توێژینەوەی نێودەوڵەتی لەبارەی ئافرەتەوە دەردەچێت، کە بارەگاکەی لە شاری مەدریدە.

تەواوی ئەم ژمارانە دەرئەنجامێکی سرووشتین بۆ ئەوەی کە ئێمە یاسا ونیزامی هاوسەرگیری ورێزی ئافرەت لە شەریعەتی ئیسلامدا بگۆڕینەوە بە نیزامی لەبەریەك ترازان وفرە هاوەڵی وفرە دۆستی ئەو کەسانەی کە هێرش دەکەنە سەر شەریعەتی ئیسلام.

## با تەماشایەکی بۆچوونی کەسە بە ویژدانەکانی ڕۆژئاوا بکەین لەم بابەتەدا

یەکێك لە ئافرەتەکانیان دەڵێت: ((بەڕاستی ژمارەی کچە سەرگەردان ودەربەدەرەکانمان زۆر بووە، ومەینەتیەکەش بە گشت لایەکدا بڵاو بووەتەوە، توێژەرەوەکانیش دەزانن کە هۆکارەکانی چییە، جا ئەگەر من ئافرەتێکم کە دەمبینیت دەڕوانمە ئەو کچانە، دڵم لەت لەت دەبێت بە هۆی بەزەیی وخۆشەویستیم بۆیان، بەڵام ئەم دڵتەنگی وئازار وواوەیلای منە چی سوودێکیان پێ دەگەیەنێت؟! باوەکو تەواوی خەڵکیش هاوخەم وهاو ئازارم بن، چونکە هیچ سوودێکی نییە، مەگەر کار بکرێت بۆ ڕێگە گرتن لەم حاڵەتە پیسە. زانایەکیان بە ناوی (تۆس) وای دەبینێت کە دەرمان وچارەسەری ئەم پەتا ونەخۆشیە ئەوەیە کە ڕەوا بکرێت بۆ پیاو کە زیاد لە ژنێك بهێنێت، کە گومانی تێدا نییە بەم هۆکارە ئەم نەخۆشیە نامێنێت، ئەوجا کچەکانمان دەبنە خاوەن ماڵ، بەڵا ومەینەتیەکی زۆر گەورەیە کە پیاوی ئەورووپی ئیجبار بکرێت لەسەر ئەوەی کە تەنها یەك ژنی هەبێت، چونکە ئەم سنوور دانانە وای لە کچەکانمان کردووە کە سەرگەردان بن، وفرەی داونەتە ناو کاروباری پیاوانەوە، کە گومانی تێدا نییە کێشە وگرفتەکە هەر ڕوو لە زیاد بوون ولەدەست دەرچوون دەکات ئەگەر ڕێگە نەدرێت بە پیاو کە زیاد لە ژنێك بهێنێت، ئەبێت چی گومانێك وچی کردەوەیەکی باش لەو پیاوانە چاوەڕێ بکرێت کە ژنیان هێناوە وچەندین منداڵی ناشەرعیان هەیە، کە بوون بە بارگرانی ومشەخۆر وشوورەیی لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا، بۆیە ئەگەر فرەژنی

ڕەوا بوایە، ئەوا ئەو هەموو ئازار وسزا وسەرگزیە ڕووی لەو منداڵانە ودایکەکانیان نەدەکرد، وئابڕووی هەردوولایشیان سەلامەت دەبوو. ئەوەتا بەربەرەکانی ئافرەتان لەسەر پیاو وێرانی وکاولکاریمان بۆ دەهێنێت، باشە نابینن کە سرووشتی ئافرەتان وامان پێ دەڵێت کە ئەوەی لەسەر ئەمە لەسەر پیاو نییە، ئەوەش کە لەسەر پیاوە لەسەر ئەم نییە. بە ڕێگەدان بە فرەژنی، هەموو ئافرەتێك دەبێت بە خاوەن ماڵ ومنداڵی شەرعی خۆی)).[1]

دانەرێکی تری ئافرەت دەڵێت: ((ئەگەر کچەکانمان لە ماڵدا کارەکەری بکەن، یان وەك کارەکەر وەهابن، باشتر وئاسان ترە لەوەی کە لە کارگەکاندا کار بکەن، کە ئەو کچە چەپەڵ دەبێت بە چڵکی کەسانێك کە بۆ هەتا هەتایە ڕەونەق وشەوقی ژیانی ناهێڵێت، ئای خۆزگە ولاتەکانی ئێمەش وەکو ولاتە ئیسلامیەکان دەبوو، کە شەرم وڕەوشت بەرزی وداوێن پاکی وخاوێنی تێدایە، کە کارەکەر وخزمەتکارەکانیش لەوپەڕی خۆش گوزەرانیدا دەژین، وهەمان مامەڵەی منداڵەکانیان لەگەڵدا دەکرێت، وهەرگیز نامووس وحورمەتیشیان بێ ڕێزی پێ ناکرێت. بەڵێ ئەوە نەنگیەکی زۆر گەورەیە بۆ ولاتی ئینگلیز کە کچەکانی بکاتە نموونەی ڕسوایی وسەرشۆڕی، بەهۆی زۆر تێکەڵ کردنیان لەگەڵ پیاوان، ئەی ئێمە بۆچی بۆ ئەوە هەوڵ نەدەین کە کچ بەو شێوە کار بکات کە لەگەڵ سرووشتی خۆیدا گونجاو بێت، ولە ماڵەوە بێت، وکاری پیاوانیش واز لێ بهێنرێت بۆ پیاوان، تاوەکو ڕێز وشەرەفی ئافرەتان بە سەلامەتی بمێنێتەوە)).[2]

---

(١) تەفسیری مەنار/ ٤/ ٤٨٥، کە ئەویش لە ڕۆژنامەی (لندن ثرو)ی وەرگرتووە، لە پێنووسی یەکێك لە دانەرەکانەوە، کە ئەوەی سەرەوە دەقەکەیەتی بە کورتی وبە وەرگێڕاوی.

(٢) تەفسیری مەنار/ ٤/ ٣٦٢، کە ئەویش لە ڕۆژنامەی (لندن ثرو)ی وەرگرتووە، لە پێنووسی یەکێك لە دانەرەکانەوە، کە ئەمە دەقەکەیەتی بە کورتی وبە وەرگێڕاوی.

ئـەوەتا فەیلەسـووفی بـەناوبانگی ئـەڵمانی (شـوبنهور) دەڵێـت: ((بەڕاسـتی یاساکانی ژن هێنان وشوو کردن لـە ئـەورووپا بـە پووچـەڵی داڕێـژراون، بـەوەی کە ئافرەتیان لەگەڵ پیاودا یەکسان کـردووە، کـە ئەمـە وەهـای لێ کـردووین کـە تەنها یەك ژن بهێنین، کە ئەمـەش نیـوەی مافـەکانمانی لەدەسـت دەرکـردووین، وئەرکەکانیشی دووقات کردۆتەوە.. هـەتا دەگاتـە ئـەوەی کـە دەڵێـت: لـەو گـەل ونەتەوانـەی کـە ڕێگـە بـە فرەژنـی دەدەن، ئافرەتێك نییـە کـە مێـردی نـەبێت وپێویستی وکاروبارەکانی بۆ ڕاپەڕێنێت، بـەڵام لای ئێمـە ئـافرەتی شوو کـردوو کەمن، کەچی ئەوانی تر هـەر لـە ژمـارە نایـەن، کـە دەیانبینیـت کەسـێك نییـە داژیاریان بێت (دوو کۆمەڵن): کچێکی شوو نەکردووی بەسـالا چـوو لـە خێزانـە پایەبــەرز ودەســـەلاتدارەکان، کــە ســـەرگەردانە وئـــاهو واوەیلایـــەتی، یـــان ئافرەتانێکی بێ هێز لە پلە نزمەکاندا، کە ئازارە سەختەکان دەچێژن وخۆیـان داوەتە بەر ناڕەحەتیەکانی کـارە گـران وقورسـەکان، لەوانەشـە زۆر بـە ڕسوایی وسەرکزی وبەد بەختی بژین کە هـەموو بـێ ڕێـزی وسەرشـۆڕیەکی تێـدا بێـت، ئـەوەتا تـەنها لـە شـاری لەنـدەن (٨٠,٠٠٠) هەشـتا هـەزار کـچ هەیـە کـە خـوێنی شەرەفیان ڕژێنراوە، وبوونەتە قوربانی کـورت هـەڵهێنان لەسـەر یـەك ژن، وەك دەرئـەنجامێك بـۆ پێـداگری وملنـەدانی ئـافرەتی ئـەورووپی، وئـەو درۆ وقسـە پڕوپووچانەی کە بۆ خۆی باسیان لێوە دەکات. باشـە کـاتی ئـەوە نـەهاتووە کـە ئێمەش فرەژنی وەك ڕاستیەك ببینین بۆ تەواوی ئافرەتان بە تێکڕا؟))[1]

(أني بيزانت) سەرکردەی (ثیصوفیة)ی[2] جیهـانی لـە کتێبەکەیـدا بـە نـاوی (الأديـان المنتشـرة في الهنـد)دا دەڵێـت: ((هـەر کاتێـك ئێمـە بـە تەرازوویـەکی

---

(١) الإسلام روح المدنيّة/ مصطفى الغلاييني/ ٢٢٤، وە ئـەو ژمارەیـەش کـە (شوبنهور) باسـی کردووە لەو کاتەی ژیانی ئەودا بووە، کە ئەو لە ساڵی (١٨٦٠) کۆچی دوایی کردووە.

(٢) وشەیەکی لێکدراوی یۆنا نییە، پێك هاتووە لە هەردوو وشەی: (theos) کە بە مانای خودا دێت، وە (Sophia) کە بە مانای حیکمەت دێت. ئێستا وەکو ڕێکخراو هەن، کە بـە زۆری لە ئەمەریکا وبەریتانیا دامەزراون، وزۆرینەی ئەندامەکانیشیان ئافرەتن. بۆ زانیـاری

دادوەری وڕاست کارەکان کێشانە بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە ڕێگەدان بە فرەژنـی لـە ئیسـلامدا _ کـە هـەم پارێزگاری وهـەم خـۆراك وهـەم پۆشـاکی ئافرەتانی تێدایـە _ دەکەوێتـە تـا قورسـەکەی، وکێشـی زۆر زیـاترە لـەو داوێـن پیسی وخراپە کاریەی ڕۆژئاوا، کە ڕێگە دەدات بە پیاوان کە ئافرەتانیان لابێت، تـەنها بـۆ تێرکردنـی ئارەزووەکانیـان، پاشـان ئەگـەر ئارەزوویـان تێـر بـوو، ئـیتر فڕێیان بدەنە سەر شەقام وڕێگەکان)).

(**غوسـتاف لوبـون**) دەڵێـت: ((نیزامـی فرەژنـی نیزامێکـی چـاکە، وئاسـتی ڕەوشـتی ئـەو نەتەوانـە بـەرز دەکاتـەوە کـە لـە ناویانـدا پـەیڕەو دەکرێـت، وخێزانەکانیشیان زیاتر بەیەکەوە پەیوەست دەکات، ڕێز وبەختەوەریەکی وەها دەبەخشێت بە ئافرەتان کە لە ئەوروپادا دەست ناکەوێت)).

ئـەوجا ئـەوەی کـە ڕابـوورد، ئـەوەمان بـۆ دووپـات دەکاتـەوە کـە نیزامـی فرەژنـی، یـان ڕێگـەدان بـە هێنـانی زیـاد لـە یـەك ژن، لەبـەر ئـەو بـارودۆخ وحاڵەتانـەی کـە شـەریعەتی ئیسـلامی باسـی لێـوە کـردوون، لـە لایـەن هـەموو بیرمەندە ڕۆژئاواییەکانەوە هەڵنەوەشێنراوەتەوە وبەرپـەرچ نەدراوەتـەوە، وەك بینیمان کە بیرمەندە بە ویژدانەکانیان شایەتیان لەسەر دابوو.

لە کۆتاییدا ئەوە دووپات دەکەینەوە کە: ئاینی ئیسلام بـە ڕەوای دانـاوە کـە پیاوێك زیاد لە ژنێك بهێنێت، لەبـەر ئـەو سوودانەی کـە باسمـان کـردن، بـەڵام ئـەم ڕێگەپێدانـەش کـۆتی بـۆ دانـراوە لـە قورئانـدا، وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ النساء/٣. لـە جێگەیـەکی تردا خوای گەورە ئاماژەی داوە بەوەی کە دادپـەروەری لـە نێـوان ژنەکانـدا زۆر

---

زیاتر بڕوانـە: (المعجم الشامل لمصطلحات الفلسفة/ دكتور عبد المنعم الحفني/ الطبعة الثالثة/ ٢٠٠٠م/ الناشر: مكتبة مدبولي القاهرة). (وەرگێڕ)

گرانـە، وەك دەفـەرموێت: ﴿ وَلَن تَسْتَطِيعُوٓاْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ ﴾ النساء/ ١٢٩. ((واتە: ئێوە هەرچەندە هەوڵ بدەن وبتانەوێت، هەرگیز نـاتوانن بـە یەك چاو تەماشای خێزانـەکانتان بکەن، وبـە دادپەروەریـەکی تـەواو لەگەڵیانـدا بجولێنەوە)).

هـەروەها بینیمـان کـە لـە فـەرموودە درەوشـاوەکانی پێغەمبەریشـدا کـە پێغەمبەر لە هیچ فەرموودەیەکدا فەرمانی نـەکردووە بـە پیـاوێکی خـاوەن ژن کە ژنێکی تر بهێنێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە، فەرمانی کردووە بەو کەسـەی کە ژنێکـی زۆری هـەبووە، کـە دەبێـت ئەوەنـدەیان تـەڵاق بـدات تـاوەکو دەگەنـە ژمارەیـەکی دیـاری کـراو، وەك باسمـان کـرد لـە فەرموودەکـەی سـالیم کـە لـە باوکیەوە گێڕاویەتیـەوە لـە غەیـەلانی کـوڕی سـەلەمەی (ثقفي)ەوە کە کاتێـك موسـوڵمان بـوو، دە ژنـی هـەبوو، پێغەمبـەریش پێـی فـەرموو: چـوار لەوانـە هەڵبژێرە.

من وەها دەبینم کە مەسەلەکە ڕوون بوویەوە، وگومانەکەش لاچوو، دەریش کەوت کە ڕێگەدان بە هێنانی ژنێك زیاتر، کە لە شەریعەتی ئیسلامیدا هاتووە، لە ڕاستیدا ڕێزێکە بۆ ئافرەتان، چونکە مرۆڤ دەبێت بە تەواوەتی تێ بفکرێـت ولێکی بداتەوە، لەبەر ئەوە کە هیچ ویژدانێکی تێدا نییە کە تـەنها بڕوانرێتـە ئەو ژنەی کە مێردەکەی ژنێکی تری هێناوە بەسـەریدا، چونکە ئـەوەی تـریش کە مێردەکە مارەی دەکات ودەیهێنێت، ئەویش هەر ئافرەتە، وشـەرعیش ڕێـزی لێ نـاوە بـەوەی کـە ڕێگـەی داوە بـە پیـاو کـە مـارەی بکـات وبیهێنێـت، وەك چارەسـەرێك بـۆ ئـەو کێشـە کۆمەڵایـەتی وئابووریانـەی کـە بـە دەسـتیانەوە دەناڵێنێت وپێیانەوە گیرۆدەیە.

داواکـارین لـە خـوای گـەورەش کـە لـە کاروبـاری دونیـا ودینمانـدا بەرچاوڕۆشنمان بکات، خۆشی ئەزانێت کە مەبەستمان چییە.

# بەشی چوارەم

## مافی ئافرەت لە هەڵبژاردنی مێردەکەیدا

ئاینی ئیسلام پیاو وژنی یەکسان کردووە لە مافی هەڵبژاردنی هەریەکەیان بۆ ئەوی تریان، ودەسەڵاتی نەداوە بە باوك ودایك کە ئیجباریان بکەن، چونکە ڕۆڵی باوك ودایك لە زن بۆ هێنان وبەشوودانی منداڵەکانیان خۆی لە ئامۆژگاری ورێنموویدا دەبینێتەوە، بۆیە بۆیان نییە کە منداڵەکانیان _ چی نێر بن یاخود مێ _ ئیجبار بکەن لەسەر هاوسەرگیریەك کە پێی ڕازی نین، بەڵکو ویست وئارەزوو وهەڵبژاردن لە کۆتاییدا هەر بە دەستی منداڵەکانە.

هاوسەرگیری یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی مرۆڤە، بۆیە ئیجبار کردنی کچێك لەلایەن یەکێك لە باوك ودایکیەوە لەسەر ئەوەی کە شوو بکات بە کەسێك کە نایەوێت، لە شەرعدا حەرامە، چونکە ستەمە وبە دەستدرێژی دادەنرێت لەسەر مافی کەسانی تر، ئافرەتیش لە ئاینی ئیسلامدا ئازادی وسەربەستیەکی تەواوی هەیە لە ڕازی بوون وڕازی نەبوون بەو کەسەی کە دێتە خوازبێنی کردنی، باوکی ئەو کچە یان سەرپەرشتیارەکەی مافی ئەوەیان نییە کە بە زۆر بیدەن بەو کەسەی کە نایەوێت، چونکە ژیانی هاوسەرگیری ناگونجێت کە لەسەر بناغەی زۆرلێکردن وناچار کردن دابمەزرێت، لەبەر ئەوەی کە زۆرلێکردن وناچار کردن دژی ئەو خۆشەویستی وسۆزەیە کە خوای گەورە خستوویەتیە نێوان ژن ومێردەوە.

ئەم بڕیارەش کە باسمان کرد دەقێکی زۆری شەریعەتە خاوێنەکەمانی لەسەر هاتووە، هەروەها چەندین ڕاستی وڕووداوی واقیعی عەمەلیش هەن کە بۆ تەواوی جیهانی ڕوون کردووەتەوە کە ئەم پێغەمبەرەی (صلی الله علیه وسلم)

کە پێشەوای هەموو مرۆڤایەتیە، خەلآت وسۆزی خوایی بووە لەگەڵ ئافرەتان وسەرپەرشتیارانیشیان، لە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ئاشکرای هەموو ئەو نیزامانەی کە لە سەردەمی نەفامیدا ستەمیان لە ئافرەت دەکرد، ومافی ئەوەی دا بە ئافرەت کە خۆی هاوسەری خۆی هەڵبژێرێت، ئەو جۆرە بەشوودانەی هەڵوەشاندەوە کە بە هەوڵ دراوە بە ناچارکردن ئەنجام بدرێت، ئەگەرچی لەلایەن باوکیشەوە بێت، ئاشکراشە کە ئەمە پێچەوانەی داب ونەریتی عەرەبەکان بووە لەو کاتەدا، وەك تاقی کردنەوەیەك وەها بووە بۆ دڵی ئیماندارەکان، کە دەبێت ڕازی بن بەو شەریعەتەی کە بەم شێوەیە ڕێزی لە ئافرەت گرتوە، وحیسابی بۆ ویست وئارەزوو وهەڵبژاردنی کردووە، دەبێت خۆیان دوور بخەنەوە وخاوێن بکەنەوە لە هەموو ئەو نیزامانەی کە بێ ڕێزی وستەمیان لە ئافرەتان کردووە، وبە چاوی سووك تەماشایان کردووە.

## تەواوی فەرموودەکانی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لەم باسەدا جەخت لەسەر بوونی ئەم مافە دەکەنەوە:

- یەکێك لەوانە، ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە کە دەفەرموێت: ((**لا تنكح الأيم حتى تستأمر، ولا تنكح البكر حتى تستأذن. قالوا يا رسول الله، وكيف إذنها؟ قال: أن تسكت**))[1] واتە: ئافرەتی بێوەژن بەشوو نادرێت، تاوەکو پرسی پێ نەکرێت وخۆی بڕیار نەدات، کچیش بە شوو نادرێت، تاوەکو داوای ڕێگەپێدانی لێ نەکرێت. ئەوجا پرسیان لە پێغەمبەر: ئەی

---

(١) البخاري/ كتاب النكاح/ باب لا ينكح الأب وغيره البكر والثيب إلا برضاها/ ٤٨٤٣، ومسلم/ كتاب النكاح/ باب استئذان الثيب في النكاح بالنطق والبكر بالسكوت/ ١٤١٩، والنسائي/ كتاب النكاح/ إذن البكر/ ٣٢٦٧، وأحمد في مسنده/ مسند المكثرين من الصحابة/ مسند أبي هريرة/ ٩٦٠٣، والبيهقي في السنن الكبرى/ كتاب النكاح/ باب إذن البكر الصمت، وإذن الثيب الكلام/ ١٣٤٧٨.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ڕێگە پێدانی کچ چۆن دەبێت؟ ئەویش فەرمووی: بەوە دەبێت کە بێ دەنگ بێت وقسە نەکات.

- هەروەها جارێك کچێك هاتە خزمەتی وگلەیی لەوە دەکرد کە باوکی بە ناچار کردن داویەتی بە شوو، ئەویش پێی ناخۆش بووە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) سەرپشکی کرد.[١]
- دەگێڕنەوە کە پیاوێك کچێکی خۆی بە زۆر بەشوو دابوو، کچەکەش هاتە خزمەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ووتی: باوکم بە زۆر بە شووی داوم، وپێشتریش کوڕە مامێکم خوازبێنی کردبووم. پێغەمبەریش فەرمووی: ((لا نكاح له، انكحي من شئت))[٢] واتە: بۆ ئەو نیکاحەکەت پێویست نابێت، بەڵکو بۆت هەیە کە پاش هەڵوەشاندنەوە شوو بکەیت بەو کەسەی کە خۆت دەتەوێت.
- دەگێڕنەوە لە خەنسائی کچی خوددامەوە کە وتوویەتی: کچ بووم وباوکم بەشووی دام ومنیش پێم ناخۆش بوو، بۆیە گلەییم بردەخزمەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش فەرمووی: ((لاتنكحها وهي كارهة))[٣] واتە: نابێت بەشووی بدەیت، لەکاتێکدا پێی ناخۆش بێت.
- دەگێڕنەوە کە ئافرەتێکی ئەنصاری ژنی پیاوێکی ئەنصاری بوو، جا پیاوەکە لە ڕۆژی ئوحوددا شەهید کرا، وکوڕێکیشی لەو پیاوە هەبوو، پاشان (دوو پیاو)مامی کوڕەکەی لەگەڵ پیاوێکی تری خزمی باوکی ژنەکە

---

(١) أبو داود في السنن/ كتاب النكاح/ باب في البكر يزوجها أبوها ولا يستأمرها/ ٢٠٩٦، وابن ماجه/ باب من زوج ابنته وهي كارهة/ ١٨٧٥، وأحمد في مسنده/ مسند بني هاشم/ مسند عبد الله بن العباس/ ٢٤٦٩.

(٢) النسائي في السنن الكبرى/ كتاب النكاح/ النهي عن أن تنكح البكر حتى تستأذن والثيب حتى تستأمر/ ٥٣٧٩.

(٣) الطبراني في المعجم الكبير/ مسند النساء باب الخاء/ خنساء بنت خدام بن خالد الأنصارية/ ٦٤١، والنسائي في السنن الكبرى/ كتاب النكاح/ باب البكر يزوجها أبوها وهي كارهة/ ٥٣٨٢.

خوازبێنیان کرد، ئەویش درا بە پیاوەکەی خزمی باوکی، ونەدرا بە مامی منداڵەکەی، بۆیە هاتە خزمەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ووتی: باوکم داومی بە پیاوێك کە خۆم نامەوێت، ونەیداوم بە مامی منداڵەکەم، منیش دەزانم کە منداڵەکەم لێ دەسەنرێتەوە. ئەوجا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بانگی باوکی ژنەکەی کرد، و(بە شێوەی پرسیار) فەرمووی: کچەکەت داوە بە فلآنە پیاو؟ ئەویش وتی: بەڵێ. پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: مارە کردنەکەت بۆ ئەو پیاوە چەسپاو نابێت، بەڵکو دەکرێت هەڵی بووەشێنیتەوە، وبڕۆ شوو بکەرەوە بە مامی منداڵەکەت.[1]

- فەرموودەیەکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەیە: کە دایکە عائشە (خوای لێ ڕازی بێت) پرسیاری لێ کرد لەبارەی ئەو کچەی کە کەسوکاری دەیدەن بە شوو، ئایا پرسی پێ دەکرێت، یان نا؟ پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بەڵێ پرسی پێ دەکرێت. جا دایکە عائیشە فەرمووی: ئەی ئەو شەرم دەکات، پێغەمبەریش فەرمووی: ئەگەر بێ دەنگ بوو، وهیچی نەوت، ئەوە ڕازی بووە. والبكر تستأذن في نفسها وإذنها صماتها)). لە جێگەیەکی تردا بەم شێوەیە هاتووە: ((والبكر يستأذنها ابوها في نفسها وإذنها صماتها)). لە هەردوو صەحیحی بوخاری وموسلیمدا هاتووە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: ((ولا تنكح البكر حتى تستأذن قالوا يا رسول الله وكيف إذنها؟ قال ان تسكت)). کچێکیش پرسیاری کرد لە پێغەمبەر کە باوکی بەشووی داوە ونەمیش پێی ناخۆشە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) سەرپشکی کرد. فەرمانی داوە بەوەی کە پرس ورەزامەندی کچ وەر بگیرێت، ونەهی کردووە لەوەی کە بە بێ ڕێگەپێدان ورەزامەندی خۆی

---

(١) عبد الرزاق في مصنفه/ كتاب النكاح/ باب ما يكره عليه من النكاح فلا يجوز/ ١٠٣٠٤، وكذا بتعبير آخر ذكره: سعيد بن منصور في سننه/ باب ما جاء في استئمار البكر والثيب/ ٥٦٨، وابن أبي شيبة في مصنفه/ كتاب النكاح/ من أجازه بغير ولي ولم يفرق/ ١٥٩٥٣.

بدرێت بە شوو، ئەو ئافرەتەی سەرپشك كردووە كە بەبێ پرس پێ كردن بە شوو دراوە، بۆیە چۆن دەبێت كە لەم هەموو فەرموودەیە لابدرێت وبە پێچەوانەوە رەفتار بكرێت!!))[1]

ئەوجا گرنگی دانی ئیسلام بە مەسەلەی هەڵبژاردن لە نێوان ژن ومێردا راستیەكەی ئەوەیە كە ئەم ئاینە گرنگی دەدات بە ناوكی سەرەكی درووست بوونی خێزان، چونكە سەرەتای خێزان بە پیاو وژن دەست پێ دەكات كە بە پێی قەناعەت وتێگەیشتنی هەردووكیان گەیشتوون بەیەك، كە ئەمەش كاریگەری دەبێت لەسەر خێزان، كاتێك كە گەورە دەبێت ولق ولایەنەكانی زیاد دەكات، خێزانیش خشتی سەرەكی وبناغەی پێكهێنانی كۆمەڵگایە، هەر لەسەر ئەو بناغەیە ساغەش شارستانی درووست دەبێت وبەهەا بەرزەكانیش گەشە دەكەن.

بەڵگەی گرنگی بوونی ئافرەت بۆ پێكهێنانی كۆمەڵگایەكی موسوڵمان، وتەیەكی (امیر الشعراء احمد شوقي)یە كە دەڵێت:

الأم مدرسة إذا اعددتها * اعددت شعبا طيّب الأعراق

واتە:

دایك قوتابخانەیە، گەر باش ئامادەی بكەی

گەلێكی ریشە خاوێن بۆ خۆت دەستەبەر ئەكەی

هەروەها وەك چۆن ئیسلام مافی هەڵبژاردنی مێردی داوە بە ئافرەت، بە هەمان شێوە مافی ئەوەشی پێداوە كە سەرپشك بێت لە مانەوە وپێكەوە ژیان یان جیابوونەوە، لەكاتێكدا كە ژیان وپێكەوە بوونیان خراپ دەبێت، ونەشدەگونجا كە رێك بكەون وپێك بهێنرێنەوە، هەر بۆیە مەسەلەی تەلاقی داناوە، ئەویش لە پێناو بەرژەوەندی ژن ومێردەكە بە یەكسانی.

---

(١) اعلام الموقعين/ ابن القيم/ ٤/ ٢٦٠ – ٢٦١/ دار الكتب العلمية.

یەکێك لەو چەمکە باوانەی کە لەبارەی ئیسلام ونیزامی خێزا نییەوە هەیە، ئەوەیە کە: تەنها پیاو مافی ئەوەی هەیە کە پەیوەندی هاوسەرێتی کۆتایی پێ بهێنێت، تەنها ئەویش خاوەن بڕیارە لە تەلاقدا، وئافرەت ئەم مافەی نییە، بەڵام ڕاستیەکەی وەها نییە.

چونکە شەریعەتی ئیسلامی بەو نیزامە بێ وێنەیەوە وەك چۆن مافی کۆتایی هێنانی پەیوەندی هاوسەرێتی داوە بە پیاو، هەروا ئەو مافەشی داوە بە ئافرەت، کە ئەم کۆتایی پێ هێنانە لەلایەن ئافرەتەوە خۆی لە چەند شێوەیەکدا دەبینێتەوە:

- ئەوەتا ئافرەت بۆی هەیە بەمەرجی بگرێت لەسەر مێردەکەی، کە مەسەلەی تەلاق بەدەستی خۆی بێت، بەو مانایەی کە هەر کاتێك بیەوێت، خۆی تەلاق بدات، کە لەم حاڵەتەدا ئافرەتەکە خۆی تەلاقی خۆی دەدات، وهەموو مافەکانیشی دەکەوێت، وهەروەکو ئەوە وەهایە کە مێردەکەی تەلاقی دابێت، بۆیە هیچ لە مافەکانی کەم نابێتەوە.
- هەروەها بۆی هەیە کە داوای جیابوونەوە بکات لە مێردەکەی، بە هۆی زیان لێکەوتنەوە، ئەگەر زیانێکی کاریگەری لە مێردەکەیەوە پێ گەیشت، ئەوکاتە دادوەر لەیەکیان جیا دەکاتەوە، ولەم کاتەشدا هەموو مافەکانی دەکەوێت بە بێ کەمو کورتی.
- هەروەها بۆشی هەیە کە (خلع) بکات، کە لەم حاڵەتەیاندا دەتوانێت لە مێردەکەی جیا ببێتەوە، بەڵام دەبێت دەسبەرداری هەندێك لە مافەکانی ببێت، چونکە هۆیەکی وەها نییە بۆ کۆتایی پێ هێنانی پەیوەندی هاوسەرگیریەکە، بۆیە هیچ دادپەروەری تێدا نییە کە مافەکانی ئەم ژنە بە مێردەکەی ببژێرێت، کە ئەو هەر مەبەستێتی وداوای ئەوەش دەکات کە پێکەوە ژیانەکەیان هەر بەردەوام بێت.

**بەڵگەش زۆرن بۆ ئەوەی کە ئافرەت سەرپشکە لە بڕیاری جیابوونەوەدا، لەوانە:**

- ئیبنو عەبباس (خودا لە خۆی وباوکیشی ڕازی بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە: کە مێردەکەی (بریرة) کۆیلەیەك بوو، پێیان دەوت: (مغیث): ئێستاش وەك بڵێیت هەر لەبەر چاومە کە بەشوێنیدا دەڕۆیشت ودەگریا وفرمێسك بە ڕیشیدا دەهاتە خوارەوە، جا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی بە عەبباسی مامی: ئەی عەبباس، سەرت سووڕ نامێنێت لە خۆشەویستی (مغیث) بۆ (بریرة)، ولە ڕق لێبوونی (بریرة) بۆ (مغیث)؟ ئەوجا پێغەمبەر فەرمووی: ئەگەر بکرێت بگەڕێیتەوە بۆ لای؟ (لە گێڕانەوەیەکدا دەفەرموێت: چونکە باوکی منداڵەکەتە) (بریرة)ش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمانم پێ دەکەیت؟ ئەویش فەرمووی: تەنها تکا دەکەم. ئەویش وتی: دەی من هیچ پێویستیم بەئەو نییە.[1] ئەمەش لە کاتێکدا کە زانی فەرموودەکەی پێغەمبەر فەرمان نییە، بەڵکو تەنها ڕاوێژێکە و ئەم سەرپشکە لەوەدا کە نەیکات، چونکە ئەو ژنە مافی خۆی بوو کە نەچێتەوە لای مێردەکەی، لەبەر ئەوە کە خۆی ئازاد بووە (مەعلووم پێشتر ژنەکە خۆشی کەنیزەك بووە).
- ژنەکەی (ثابت)ی کوڕی قەیس هاتە خزمەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من ڕقم لە دین ورەوشتی (ثابت)

---

(١) البخاري/ كتاب الطلاق/ باب شفاعة النبي صلى الله عليه وسلم على زوج بريرة/ ٤٩٧٩، والنسائي/ كتاب آداب القضاة/ شفاعة الحاكم للخصوم قبل فصل الحكم/ ٥٤١٧، وابن ماجه/ كتاب الطلاق/ باب خيار الأمة إذا أعتقت/ ٢٠٧٥، والدارمي/ كتاب الطلاق/ باب في تخيير الأمة تكون تحت العبد فتعتق/ ٢٢٩٢، وابن حبان/ كتاب الطلاق/ ٤٢٧٣، والدار قطني/ كتاب زكاة الفطر/ باب في أوامر النبي/ ١، والطبراني في المعجم الكبير/ باب العين/ أحاديث عبد الله بن العباس/ ١١٩٦٢، والبيهقي في السنن الكبرى/ كتاب النكاح/ باب الأمة تعتق وزوجها عبد/ ١٤٠٤٥.

نییە، بەلاّم ئەوەندە هەیە کە خۆشم ناوێت (لە گێڕانەوەیەکی تردا وتوویەتی: پێم ناخۆشە کە موسوڵمانم کارێك بکەم کە خراپ بێت لەگەڵ مێردەکەم، و لە کافر بوون نزیکم بکاتەوە)، پێغەمبەریش فەرمووی: باخچەکەی بۆ دەگەڕێنیتەوە؟ ئەویش وتی: بەڵێ. ئیتر باخچەکەی بۆ گەڕاندەوە، و پێغەمبەریش فەرمانی پێ کرد (کە باخچەکە وەربگرێتەوەو تەلاّقێکی بدات)، وپاشان لە یەکتر جیابوونەوە.[١]

ئەمە وەکو ڕوونکردنەوەیەکی کورت بۆ مەسەلەی هەڵبژاردنی ژن بۆ مێردی خۆی، وڕێز گرتن لە ویست وئارەزووی ئەو ژنە، ئەگەر ویستی لە مێردەکەی جیا ببێتەوە. هەر بۆیە نە باوك ونە هیچ کەسێکی تریش بۆیان نییە کە کوڕ یان کچ ناچار بکەن بە هاوسەر بوونیان لەگەڵ کەسێك کە پێیان ناخۆشە وحەزیان لێی نییە، هەروەها ئافرەت بۆی هەیە کە کۆتایی بە پەیوەندی هاوسەرێتی بهێنێت بەو شێوانەی کە باس کران، وخوای گەورەش لە هەموان بالاّدەست تر وزانا ترە.

---

(١) البخاري/ كتاب الطلاق/ باب الخلع وكيفية الطلاق فيه/ ٤٩٧١، والنسائي/ باب ما جاء في الخلع/ ٣٤٦٣، وابن ماجه/ باب المختلفة تأخذ ما أعطاها/ ٢٠٥٦، والدار قطني/ باب المهر/ ٢٨، والطبراني في المعجم الكبير/ باب السين/ سهل بن الحنظلية الأنصاري/ ١١٩٦٩، والبيهقي في السنن الكبرى/ كتاب الخلع والطلاق/ باب الوجه الذي تحل به الفدية/١٤٦١٥.

# بەشی پێنجەم

# پێش نوێژی کردنی ئافرەت

نوێژ عیبادەتێکە کە خوای گەورە چۆنێتی وشێوازی بۆ داناوە، وهەولی هیچ کەسێکی تێدا نییە. هەر خۆشی چەند مەرجێکی بۆ داناوە، تاوەکو درووست بێت. نێرینەیی کەسی پێشنوێژی کردووە بە یەکێك لە مەرجەکانی کردنی نوێژ بە کۆمەڵ، کە ئەمەش نە مافە بۆ پیاو، ونە کەمکردنەوەی پلە و پایەی ئافرەتیشە، بەڵکو بەر لە هەموو شتێك ئەمە مەسەلەیەکی (تعبّدي)یە.[1]

موسوڵمانانیش لە ڕێز گرتنی ئافرەتدا یەکدەنگن، پێشیان وایە کە ڕێگە نەدان بە پێش نوێژی ئافرەت ڕێزی تێدایە بۆی، نەوەك بێ ڕێزی وسووك سەیر کردن.

یەکێکیش لە فەرمانە ئیسلامیەکان بۆ ئەم مەبەستە ئەوەیە کە خوای گەورە فەرمانی کردووە بە ئافرەتان کە لە پشتەوەی ڕیزی پیاوانەوە بووەستن، چونکە نوێژ کردنی موسوڵمانان سوجدە وکڕنووش بردن لەخۆ دەگرێت، کە ئەمە وەك ئەو وتە عەرەبیە وەهایە کە دەڵێت: (إنما أخرك ليقدمك). واتە: بۆیە دوای خستی، تاوەکو پێشت بخات. بەواتایەکی تر: ئەو دواخستنە خۆی بۆخۆی پێشخستنە. بۆیە خستنە دواوەی ئافرەتان لە ڕیزەکانی نوێژدا جۆرێك نییە لە جۆرەکانی دابەزاندنی ڕێز وپلەی ئافرەتان، بەڵکو لەبەر بەرز کردنەوە

---

(١) مەسەلەی (تعبدی) بەو مەسەلەیە دەوترێت کە ئێمە وەکو موسوڵمان دەبێت پێیەوە پابەند بین، ئەگەرچی نەشزانین چی حیکمەتێکی تێدایە. (وەرگێڕ)

وڕێزگرتن وڕەچاو کردنی پەروەردە وشەرم وئەدەبە بەرزەکانە، هەروەها هاوکاریەکیشە لە نێوان پیاوان وئافرەتاندا لە گوێڕایەڵی کردن وجێبەجێ کردنی فەرمانی شەرع سەبارەت بە گرتنی چاوەکان ونەزەر نەکردن.

## لە ڕاستیدا مەسەلەی پێشنوێژی ئافرەت بۆ پیاو لە دوو گۆشەوە تەماشا دەکرێت:

گۆشەی یەکەم: بریتیە لە واقیعی کار وهەڵسووکەوتی موسوڵمانان بە درێژایی مێژوو.

گۆشەی دووەم: سامان وبەرهەمە فیقهیەکان، وکتێب ونووسراوە متمانەدارەکان، بەلای موسوڵمانانەوە.

**سەبارەت بە واقیعی کاری موسوڵمانان:** ئەبینین کە موسوڵمانان لە ڕۆژ هەڵات وڕۆژ ئاوا، وئەوانەی پێشینە وپاشینەش هەموو بە کردار کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە ئافرەت نابێت بانگ بدات، ونابێت پێش نوێژی بۆ پیاوان بکات و، نابێت پێش نوێژی نوێژی هەینی بکات. چونکە مێژووی ئیسلامی بە درێژایی چوارده سەدە بەخۆیەوە نەبینیوە کە: ئافرەتێك وتاری هەینی خوێندبێت، وپێشنوێژی بۆ پیاوان کردبێت، هەتاوەکو لەو سەردەمانەشدا کە ئافرەت فەرمان ڕەوا بووە، وەکو (شجرة الدر)[1] لە میصر لە کاتی پاشایەتیدا، لەو سەردەمەشدا ئافرەت وتاری هەینی نەخوێندۆتەوە، وپێشنوێژیشی بۆ پیاوان نەکردووە.

---

(١) ژنی یەکێك لە پاشا ئەیوبیەکان بووە لە میصر وپاشان خۆشی بووە بە دەسەڵاتداری ئەو وڵاتە، ولە ساڵی (١٢٥٧) ی زاینی کۆچی دوایی کردووە (کوژراوە) وهەر لەوێش بە خاك سپێرراوە، دواتریش لە باسی ئەو ئافرەتانەی کە فەرمانڕوابیان کردووە، بە درێژی باس دکرێت. (وەرگێڕ)

سەبارەت بە سامان وبەرهەمە شەرعیەکانیش: کاتێك کە تەماشای دەقی نوسراو وکتێبە فیقهیەکان دەکەین، دەبینین کە: زانایانی فیقهی ئیسلامی پێناسەی پێشنوێژیان بەوە کردووە کە: بریتیە لە بەستنەوەی نوێژی کەسێك بە نوێژی کەسێکی ترەوە بەو مەرجانەی کە شەرع بە ڕوونی داینـاون. کەوابوو پێشنوێژ نابێت بە پێشنوێژ مەگەر کەسێك بێت ونوێژەکەی خۆی بە نوێژی ئەوەوە ببەستێتەوە، کە ئەم پێکەوە بەستنەش خۆی لە خۆیدا پێشنوێژیەکەیە وهەر ئەویش مەبەست وئامانجی ئیقتیدا وشوێن کەوتنەکەیە.

## سەبارەت بەو دەقە شەرعییە پیرۆزانەش کە لەم مەسەلەیەدا هاتوون، دوو فەرموودەی پێغەمبەرن:

یەکەم: فەرموودەیەکە کە ومرەقەی کچی عەبدولای کوڕی (حارث) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بانگبێژێکی بۆ دانا کە بانگی بۆ بدات، وفەرمانیشی پێ دا کە خۆی پێشنوێژی بۆ کەسەکانی ناو خێزانەکەی بکات.[1]

دووەم: فەرموودەیەکە کە جابیری کوڕی عەبدولا، لە گێڕانەوەیەکیدا بۆ یەکێك لە وتارەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بۆمان دەگێڕێتەوە،

---

(١) أبو داود في السنن/ كتاب الصلاة/ باب إمامة النساء/ ٥٩٢، وأحمد في مسنده/ مسند القبائل/ حديث ورقة بنت عبد الله بن الحارث الأنصاري/ ٢٧٣٢٤، والدار قطني/ كتاب الصلاة/ باب صلاة النساء جماعة وموقف إمامهن/ ١، والطبراني في المعجم الكبير/باب من يعرف من النساء بالكنى لمن لم ينته إلينا أسماؤهن ممن لهن صحبة/ أم ورقة بنت عبد الله بن الحارث الأنصارية، والبيهقي في السنن الكبرى/ كتاب الحيض/ باب إثبات إمامة المرأة/ ٥١٣٦. وە لە ڕیوایەتێکی تردا بەم شێوە هاتووە کە حەزرەت فەرموویەتی: ((انطلقوا بنا نزور الشهيدة وأذن لها أن تؤذن لها وأن تؤم أهل دارها في الفريضة (الفرائض)))./ ابن خزيمة/ كتاب الصلاة/ باب إمامة المرأة النساء في الفريضة/ ١٦٧٦، والحاكم في المستدرك/ كتاب الصلاة/ باب فضل الصلوات الخمسة/ ٧٣٠، والبيهقي في السنن الكبرى/ كتاب الحيض/ باب إثبات إمامة المرأة/ ٥١٣٧.

ودەفەرموێت: پێغەمبەری خوا وتاری بۆ داین... تاوەکو گەیشتە ئەوەی کە فەرمووی: ئاگادار بن کە نابێت هیچ ئافرەتێك پێشنوێژی بۆ هیچ پیاوێك بکات، یا عەرەبی دەشتەکیش پێشنوێژی بۆ کۆچبەر (مهاجر) نەکات، یا کەسی خراپەکاریش پێشنوێژی بۆ کەسی ئیماندار نەکات، مەگەر بە زۆری شمشێر وقامچی خۆی سەپاندبێت، ولێی بترسن.(١)

هەندێك لە فەرموودەناسان ئەو فەرموودەی یەکەمیان بە فەرموودەیەکی لاواز داناوە، وەك شێخی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، کە فەرموویەتی: لە زنجیرەی گێڕانەوەکەیدا عەبدولرەحمانی کوڕی خەلاد هەیە کە ئەو کەسایەتیەش (فیه جهالة). واتە: یان کەسێکی نەناسراوە، یان کەسێکە تەواوی سیفەتەکانی زانراو نییە.(٢)

فەرموودەی دووەمیش زۆرێك لە فەرموودەناسان بە لاوازیان داناوە، کەوابوو لە فەرموودەی یەکەم زۆر لاواز ترە، چونکە شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: لە زنجیرەی گێڕانەوەکەیدا عەبدولای کوڕی موحەمەدی عەدەوی هەیە، کە وەکیعی بەصری تاوانباری کردووە بەوەی کە فەرموودە دادەنێت، مامۆستاکەشی کە عەلی کوڕی جەدعانە ئەویش کەسێکی لاواز وبێ هێزە.(٣)

## سەبارەت بە سامان وبەرهەم وکتێبە فیقهیەکانی موسوڵمانان

لەم مەسەلەیەدا: _ کە ئەویش تێگەیشتنێکی درووستی ڕێسا گشتیەکانی شەریعەتە، بە تایبەتی کاتێك کە کۆدەنگی لەسەر هاتبێت _ ئەوەتا تەواوی

---

(١) ابن ماجه/ كتاب إقامة الصلاة والسنة فيها/ باب في فرض الجمعة/ ١٠٨١، والطبراني في الأوسط/ ٢/ ٦٤/ ١٢٦١، وأبو يعلى في مسنده/ مسند جابر/ ١٨٥٦، والبيهقي في السنن الكبرى/ كتاب الجمعة/ ٥٢٥٩، والأصبهاني في حلية الأولياء/ سباع الموصلي/ ٨/ ٢٩٦.

(٢) تلخيص الحبير/ ٢/ ٣٦ – ٢٧/ أحمد في مسنده بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني/ المدينة المنورة، ١٣٨٤ – ١٩٦٤/ تحقيق: السيد عبدالله هاشم اليماني المدني.

(٣) تلخيص الحبير/ ٢/ ٣٢.

زانایانی هەر چوار مەزهەبەکە، بەڵکو هەر هەشت مەزهەبەکە[١]، وحەوت زانا وشارەزاکانی شاری مەدینەی پیرۆزیش[٢] کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە نابێت ئافرەت پێشنوێژی -بۆ پیاو- بکات لە نوێژە فەرزەکاندا، هەر پیاوێکیش نوێژ لە دوایەوە بکات نوێژەکەی درووست نییە. بەلاّم هەندێك لە زانایانی وەك: (ابو ثور ومزني وابن جرير) بە شێوەیەکی تاك ڕەوی وبەدەر لەو کۆدەنگیە پێیان وایە کە نوێژی پیاوان لە پشت ئافرەتەوە لە نوێژە فەرزەکانیشدا هەر درووستە[٣]، هەروەها موحێدینی ئیبنو عەرەبیش، کە زاهیری مەزهەبە، هەمان بۆچوونی هەیە.

سەبارەت بە نوێژە سونەتەکان ونوێژی تەراویحیش، ئەوە زۆرینەی زانایان هەر پێیان وایە کە نابێت، بەلاّم هەندێك لە پەیڕەوانی ئیمامی ئەحمەد بە پێچەوانەی ئەوانەوە، وتوویانە: درووستە ئافرەت پێشنوێژی بکات بۆ پیاوان لە نوێژی سونەت وتەراویحدا، یەکێك لەوانە (ابن مفلح)ە کە لەسەر پێشنوێژی ئافرەت باسی کردووە، ووتوویەتی: ((لە نوێژی سونەتدا درووستە، لە تەراویحیشدا درووستە، وتراوە: درووستە ئەگەر لە خوێندنی قورئاندا باشتر بێت، وتراوە: ئەگەر ژنەکە قورئان خوێن بێت، بەلاّم نوێژکەرە شوێن کەوتوەکان قورئان خوێن نەبن، وتراوە: درووستە ئەگەر خزم بن، وتراوە: درووستە ئەگەر ئافرەتەکە پیر وبەساڵاچوو بێت، بەلاّم لە دوای پیاوەکانەوە

---

(١) واته: (مالكي وحنفي وشافعي وحنبلي وجعفري وزيدي وظاهري واباضي).

(٢) واته: (سعيد بن المسيب والقاسم بن محمد وعروة بن الزبير وخارجة بن زيد وأبو سلمة بن عبد الرحمن وعبد الله بن عتبة بن مسعود وسليمان بن يسار).
بڕوانه: الجامع لأحكام القرآن للقرطبي/ ٨/ ٢١٥، وحلية الأولياء لأبي نعيم الأصفهاني/٢/١٦١، نصب الراية للزيلعي/ ٢/ ٧٢، وعمدة القاري للبدر العيني/ ١/ ٢٨، والمهذب لأبي إسحاق الشيرازي/ ٢/ ٤٤٩، والسيل الجرار للشوكاني/ ١/ ١٠٢، والاحتجاج بالشافعي للخطيب البغدادي/ ١/ ٧٠ - ٧١، وتدريب الراوي للسيوطي شرح تقريب النووي/ ٢/ ٢٤٠، ومقدمة ابن الصلاح/ ١/ ١٧٩. (وەرگێڕ)

(٣) الموسوعة الفقهية: حرف الذال: ذكورة/ ٢١/ ٢٢٦.

ڕابووەستێت، چونکە وا باشترە کە نەیبینن، وتراوە: ئافرەتەکە شوێنی ئەوان دەکەوێت وئیقتیدا بەوانەوە دەکات لە تەواوی نوێژەکەدا، بێجگە لە خوێندنی قورئانەکە، جا یەکێك لە پیاوەکان نییەتی پێشنوێژی دەهێنێت، زۆرێکیش لە زانایان ئەوەیان هەڵبژاردوە کە پێشنوێژی ئافرەت لە هەندێك کاتدا درووستە، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە وەرەقە خۆی گێڕاویەتیەوە، یان ئەوەی کە هاوەڵان لەسەر ئوم وەرەقە گێڕاویانەتەوە)).[1]

هەر بۆیە ئێمەش ئەو یەکدەنگیەی زانایانی پێشینە وپاشینەمان لە وتە وکردارپاندا پێ درووست وپەسەند ترە، وفەتواش هەر بە ئەمە دەدەین، چونکە بەڵگەکانیان بەهێز ترە، وبیر وڕوانینەکەشیان قووڵ ترە. وتەی ئەم زانایانەشمان (کە شاز بوو) بۆیە هێنا تەنها لەبەر ئەمانەتی زانستی، نەك لەبەر ئەوەی کە کاری پێ بکرێت. هەر بانگەشە کردنێکیش بۆ ئەوەی کە کار بەم وتە شازە بکرێت ئەوە تۆمەتبارکردنی زانایانی پێشینە وپاشینەی تێدایە، هەرگیز نەتەوەی ئیسلامیش لەسەر گومڕایی کۆنابنەوە، کەواتە کۆدەنگی بەڵگە وحوججەتە، وهەر بەو کۆدەنگیەش زۆرێك لە مەسەلە فیقهیەکانی ئەم شەریعەتەپیرۆزە (ضبط) کراون.

ئەوجا حیکمەتیش لە دوور خستنەوەی ئافرەت لە مەسەلەی پێشنوێژی کردن، ئەوەیە کە: زیاتر گونجاو بێت لەگەڵ ئەو فەرمانەی کە ئەم ئاینە پیرۆزە کردوویەتی بۆ داوێن پاکی وخۆپارێزی، گونجاو تر بێت لەگەڵ ئەو فەرمانەی کە کراوە بۆ ئیماندارن بە پیاو وژنەوە بە یەکسانی کە چاوی

---

(١) الفروع لابن مفلح المقدسي/ كتاب الصلاة/ باب الإمامة/ فصل: من لا تصح إمامته/ إمامة امرأة بغير نساء/ ج٢/ ص١٦. جا بۆ زیاتر تێگەیشتن پێم باشە کە دەقی وتەکەی (ابن مفلح) وەك خۆی بهێنین، کە بەم شێوەیە: ((وعنه تصح في النفل، وعنه في التراويح، وقيل: إن كانت أقرأ، وقيل: قارئة دونهم، وقيل: ذا رحم، وقيل: أو عجوزاً، وتقف خلفهم لأنه أستر، وعنه: تقتدي بهم في غير القراءة، فينوي الإمامة أحدهم، واختار الأكثر الصحة في الجملة لخبر أم ورقة العام والخاص)). (وەرگێڕ)

خۆیان بگرن وبپارێزن، ئەمریان پێ کراوە بەوەی کە عەورەتی خۆیان داپۆشن، ئاشکرایشە کە عەورەتی ئافرەت تەواوی گیان ولاشەیەتی بێجگە لە دەم وچاو ودەستەکانی، هەر بۆیە خوای گەورەش فەرمانی بە ئافرەتان کردووە کە لە پشتی ڕیزی پیاوەکانەوە ڕاوەستن، چونکە لە نوێژی موسوڵماناندا کڕنووش بردنی تێدایە، کە دەکرێت لاشەی ئافرەتی تێیدا دەربکەوێت وئاشکرا ببێت.

سەبارەت بەوەی کە ئێستا لە جیهاندا دەیبینین وهەموو کەسێکیش دەیبینێت، لەوەی کە تێکەڵ کردنێك هەیە لە نێوان هەردوو مەسەلەی: پێشنوێژی، ووتارخوێندنی ڕۆژی جومعە، ئەمەی دووەمیان هیچ کەسێك بە درووستی نازانێت وڕێگەی پێ نادات، ئەو تێکەڵ کەرانەش لەوانەن کە سەر بە قوتابخانەی جیابووەوەکانن، کە چەند تەوژمێك لەخۆ دەگرێت: هەندێکیان ئینکاری فەرموودەی پێغەمبەر وکۆدەنگی زانایان دەکەن. هەندێکیشیان یاری وگاڵتە بە مانا وچەمکەکانی وشە ورستەکانی زمانی عەرەبی دەکەن، هەندێکیشیان بانگەشە بۆ ڕێگەپێدانی مارەکردنی ڕەگەزی هاووێنە لەیەکتر **(الشذوذ الجنسي)** وزینا وعارەق ولەبار بردنی کۆرپە وگۆڕینی بەشە میراتەکان وهاووێنەی ئەمانە دەکەن، کە لە هەموو سەردەمانێکدا ئەم جۆرە بانگەشانە هەر هەن ودەردەکەون، بەڵام دواتر کپ دەبنەوە ودیار نامێنن، وموسوڵمانانیش هەر لەسەر ئەو ڕێگە وبەرنامە دەڕۆن وبەردەوامن کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردوون، وبە کوڵی خۆشیان نامەی کامەرانی وبەختەوەریان بۆ هەردوو دونیای خەڵکی هێناوە. چونکە ئەوەی کە چڵك وکەفی سەر ئاو ودەریاکانە هەروا بە بێ سوود دەڕوات، بەڵام ئەوەی کە جێگەی سوودمەندی خەڵکە هەر دەمێنێتەوە، (وەك خوای گەورە دەفەرموێت): ﴿فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذۡهَبُ جُفَآءٗۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمۡكُثُ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَالَ﴾ الرعد/١٧. ((واتە: هەرچی کەفوکوڵە جیادەبێتەوە ودەڕوات وفڕێ دەدرێت، بەڵام ئەوەی کە مایەی سوودە بۆ ئادەمیزاد لە زەویدا

دەمێنێتـــەوە، خـــودا بـــۆ جیاکردنـــەوەی حـــەق وناحـــەق نموونـــەی ئـــاوا دەهێنێتەوە)).

بـــەڵکو ئـــەم کورتـــە باســـەش لـــەم مەســـەلەیەدا بڕیـــاری شـــەرعی ڕوون کردبێتەوە، وخوای گەورەش لە هەموان بالأدەست وزاناترە.

# بەشی شەشەم

# خەتەنە کردنی مێیینەکان

بەر لە هەموو شتێك دەبێت ئەوە بزانین کە، مەسەلەی خەتەنە کردنی مێیینە، لە ئەصلْدا مەسەلەیەکی (تعبّدي) نییە، (کە پێویست بێت بکرێت، وئێمەش بۆمان نەبێت کە بپرسین: بۆچی وەهایە؟) بەڵکو مەسەلەیەکی پزیشکی ئاساییە _ واتە: لەو داب ونەریتانەیە کە لە پێشینانەوە ماونەتەوە، وزیاتریش بە پشت بەستن بووە بە وتە وئامۆژگاری پزیشکەکان _، ئەم عادەتەش هەروا لە کۆنەوە لە وڵاتانی حەوزی نیلدا بڵاو بووەتەوە. ئەوتا میصریە کۆنەکان وگەلانی تر کە لەسەر ڕووباری نیل بوون، هەم مێیینە وهەم نێرینەشیان خەتەنە دەکرد، وپاشان ئەم عادەتە گوازرایەوە بۆلای هەندێك لە عەرەبەکان، وەکو ئەوانەی شاری مەدینەی پیرۆز، بەڵام لە شاری مەکەی پیرۆز ئەم عادەتە بڵاو نەبوو، هەر بۆیە کاتێك کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕۆیشت بۆ مەدینە، وبینی کە ئەو عادەتە لەوێ هەیە وباویشە، یەکسەر هەستا بە ئامۆژگاری کردنی ئەو کەسانەی کە کاری خەتەنە کردنی مێیینەیان ئەنجام دەدا، بەوەی کە زیادەڕەوی نەکەن لە کارەکەیاندا، وەکو لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە ئومو عەتیە بۆمان دەگێڕێتەوە کە: ئافرەتێك لە شاری مەدینە کاری خەتەنە کردنی دەکرد، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: زیادەڕەوی تێدا مەکە وزۆری لێ مەبڕە، چونکە بۆ چێژی ئافرەتەکە وەها باشترە، ومێردەکەشی وای پێ خۆش ترە.[1]

---

(١) أبو داود في السنن/ كتاب الأدب/ باب ما جاء في الختان/ ٥٢٧١، والحاكم في المستدرك/ كتاب معرفة الصحابة/ ذكر الضحاك بن قيس الأكبر/ ٦٢٣٦، والطبراني في المعجم الكبير/ باب الضاد/ ما أسند الضحاك بن قيس/ ٨١٣٧، والبيهقي في شعب الإيمان/ الستون من =

خەتەنە کردنیش وەکو پزیشکەکانی ئەم سەردەمە تازەی خۆمان وەسفی دەکەن لە چوار قۆناغی هەیە:

**یەکەمیان:** جۆرێکە لە جۆرەکانی نەشتەرگەری جوانکردن (**عملیات التجمیل**)، کە زۆرێك لە پزیشکەکان ئامۆژگاری پێ دەکەن لە کاتی پێویستیدا. کە خەتەنە کردن بە مانا ئیسلامیەکەی ئەم جۆرمیانە وبەم شێوەیە.

**بەلاّم قۆناغەکانی تر:** ئەگەر چی لای پزیشکەکان وا باوە کە هەر بە خەتەنە کردن ناو دەبرێن، بەلاّم لە ڕاستیدا هەموویان بە گوێرەی ئەم شەریعەتە بەڕێز وگەورەیە بە دەست درێژکاری دادەنرێن، چونکە تاوانی بۆ سەر ئەندامێکی لاشە تێدایە کە لە هەموو ئەندامەکانی تر هەستیار ترە، هەتا ڕادەیەك کە ئەم دەست درێژیە پێویست دەکات سزای لەسەر بێت وخوێنی لە تۆڵەدا وەربگیرێت (وەك خوێنی کوشتنی کەسێك) ئەگەر بوو بە هۆی خراپ کردنی ئەو ئەندامە، وەکو لە بڕیارەکانی ئەم شەرعیەتە دەروشاوەدا هاتووە.

لەگەڵ ئەوەی کە باسمان کرد، نەهاتووە لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) کە کچەکانی خۆی خەتەنە کردبێت، وخەتەنەشی نەکردوون، لەگەڵ ئەوەی کە ئەم عادەتە تەواو بلاّو بووبوویەوە لە مەدینەدا، کە ئەویش پێشەنگی ئێمەیە لەو ڕێگە ڕاستەدا. هەروەها هیچ دەقێکی شەرعی درووست وڕاشکاویش نەهاتووە، کە فەرمان بکات بە موسوڵمانان کە کچەکانیان خەتەنە بکەن، هەتاوەکو بەو مانایەی قۆناغی یەکەمیش کە پزیشکەکان لە هەندێك حاڵەتدا ئامۆژگاری پێ دەکەن، هەر بۆیە بەردەوامی ئەو عادەت وداب ونەریتە دەخرێتە ئەو بابەوە کە ڕەوایە وحەلاڵە ئەگەر زیانی لێ نەکەوێتەوە. بەلاّم لەگەڵ دەرکەوتنی ئەو زیان وزەرەرە زۆرانەی کە هەندێك جار سەردەکێشن بۆ

---

= شعب الإيمان وهو باب في حقوق الأولاد والأهلين/ ٨٦٤٥، وفي السنن الكبرى/ كتاب الأشربة والحد فيها/ باب السلطان يكره على الاختتان أو الصبي وسيد المملوك يأمران به/ ١٧٢٣٧.

مردن، بەو شێوەیەی کە پزیشکەکان لە سێ قۆناغەکەی تردا باسیان لێوە کردووە، ئەوە پێویستە وواجیبە کە رێگەی لێ بگیرێت ونەهێڵدرێت بکرێت، دەرکەوتن ورووودان وتووش بوون بەو زیانانەش دەکرێك کە بە هەر هۆیەکەوە بێت، وەك: گۆڕانی چەرخ وزەمەن، یان خۆراك وبژێوی کەسەکان، یان ئاو وهەوای ئەو ناوچەیە، یان هەر هۆکارێکی تر. موسوڵمانانیش بەوپەڕی وریایی وتێگەیشتنەوە لە نیزامی یاسایی وئەخلاقی خۆیان، مامەڵە لەگەڵ ئەم واقیعە تازەیەدا دەکەن.

بە تەماشا کردنی ئەو بەرەوپێش چوونە یاساییانەی کە لە میصردا هەیە، لەم مەسەلەیەدا بۆ نموونە، دەبینین کە یەکەمین دەقێك کە لە میصر دەرچوو بێت سەبارەت بە خەتەنە کردنی مێیینەکان، بریتیە لەو بڕیارە وەزاریەی ژمارە (٧٤)ی ساڵی (١٩٥٩)ز.

کە ئەم بڕیارەش لە مادەی یەکەمیدا ئەوەی لەخۆ گرتوە کە بە ئاشکرا ناوی لیژنەیەکی پانزە کەسی لە زانایانی ئاینی وپزیشکەکان هێنابوو، کە یەکێکیان بریکاری وەزارەتی تەندرووستی (ئەو کاتە بووە) کە ناوی: (**مصطفى عبد الخالق**) بووە، یەکێکیشیان موفتی ولاتی میصر، کە ناوی (**حسن مأمون**) بووە، ویەکێکی تریشیان موفتی پێشووی میصر بە ناوی (**حسنين محمد مخلوف**).

## جا لە مادەی دووەمی ئەو بڕیارەدا هاتبوو کە لیژنەکە ئەم بڕیارانەی دەرکردووە:

- حەرام بکرێت بە هەموو شێوەیەك بۆ کەسێك کە پزیشك نەبێت بەو کارە هەستێت، دەبێت خەتەنە کردنەکەش بۆ هەندێك گۆشت بێت، نەوەکو تەواوەکەی، ئەویش بۆ کەسێك کە خۆی داوای بکات وبیەوێت.
- لە یەکەکانی وەزارەتی تەندرووستیدا نابێت خەتەنەکردن ئەنجام بدرێت،

ئەویش لەبەر چەند هۆکارێکی تەندروستی وکۆمەڵایەتی ودەروونی.

- ڕێگە نادرێت بە ئەو مامانانەی کە ئیجازەی یاساییان هەیە کە هەستن بە هیچ کارێکی نەشتەرگەریانە، کە یەکێك لەو کارانە بریتیە لە خەتەنە کردنی مێیینەکان.
- خەتەنەکردن بەورێگەیەی کە ئێستا پەیڕەو دەکرێت زیانی تەندروستی و نەفسی بۆ مێیینەکان هەیە، بەر لە شوو کردن یان پاش شوو کردن.

ئەوجا کاتێك کە حاڵەتەکانی خەتەنە کردن زۆر بوو، وئەو زیانە زۆرانەشی بە تەندرووستی مێیینەکان گەیاند، ئیتر وەزیری تەندرووستی میصر بڕیارێکی وەزاری دەر کرد، لە بەرواری: ٨/ ٧/ ١٩٩٦، بە ژمارەی (٢٦١)ی ساڵی (١٩٩٦)ز کە دەڵێت: نەشتەرگەری خەتەنە کردن بۆ مێیینەکان قەدەغەیە، ئیتر ئایا لە خەستەخانەکاندا بێت یان لە بنکە ویەکە تەندرووستیە گشتیەکان، یان تایبەتیەکان. ڕێگەش بە ئەنجام دانی ئەو نەشتەرگەریە نادرێت مەگەر تەنها لە حاڵەتەکانی نەخۆشیدا، کە ئەو حاڵەتانەش دەبێت لەلایەن سەرۆکی بەشی نەخۆشیەکانی ئافرەتان ومنداڵ بوون دیاری بکرێن، کە ئەویش بەپێی پێشنیار وڕاسپاردەی پزیشکی چارەسەرکەر دەبێت.

جا هەندێك موسوڵمان کە ئاسۆی بڕیاردانیان فراوان نەبوو، توانای زانستیان بەو ڕادەیە نەبوو، وایان گومان دەبرد کە ئەو بڕیارە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامیە، کەوابوو پێچەوانەی دەستووری میصریشە، هەر بۆیە هەستان بە بەرز کردنەوەی داوایەکی دادگایی لەلای دادگای کارگێڕی (القضاء الإداري)، ئەو دادگایەش لەو بڕیارەی کە دەری کرد باسی لە چەند حەیسیاتێك کردووە بۆ دەرکردنی بڕیارەکە، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

((دادگای کارگێڕی گەیشتە ئەو ڕاستیەی کە بەپێی ڕێز کردن وهێنانی ئەو بۆچوونە فیقهانەی پێشتر کە هەبوون: شەریعەتی ئیسلامی بڕیارێکی یەکلایی کەرەوە ودەقێکی قەتعی تێدا نییە کە بڵێت: ئافرەت دەبێت خەتەنە بکرێن،

یـان نابێـت خەتەنـە بکرێـت، هـەر بۆیـە تـەواوی ئـەو بڕیارانـەش کـە لـەم مەسـەلەیەدا هـاتوون، هـەموویان (ظـني الدلالـة)ن، واتـە: چـەند مانایـەك هەڵدەگرن، بـەو پێیـەی کە زانستی پزیشکیش یـەك دەنـگ نییە لەسـەر ئەم مەسەلەیە، بەڵکو هەنـدێك وای بـۆ چوون کـە خەتەنـە کردنـی مێیینـەکان لـە ڕووی پزیشکیەوە بەرژەوەندی تێدایە، وهەندێکی تریش پێیان وایە کـە خـراپ تـرین زیـانی دەروونـی وتەندرووسـتیان پـێ دەگەیـەنێت، بـەو پێیـەی کـە کاربەدەستی وڵات بۆی هەیە ئـەو کاروبارانـە ڕێـك بخـات، کە دەقێکـی شـەرعی قـەتعیان لەسـەر نـەهاتووە نـە لـە قورئـان ونـە لـە سـونەتی پێغەمبەریشـدا، زانایانیش یـەك دەنـگ نـین، هـەروەها بـەو پێیـەی کە کاربەدەسـتی وڵات بـۆی هەیـە ئـەو مەسـئەلانەش ڕێـك بخـات کـە زانایـان تێیانـدا نـاکۆکن، ویـەك بۆچوونیان نییە. بە شـێوەیەکی گشـتی (دەتوانێـت) هـەموو ئـەو مەسئەلانەش ڕێـك بخـات کـە درووسـتە ئیجتیهادیـان تێـدا بکرێـت، ئـەم ڕێکەیـەش کـە کاربەدەستی وڵات دەیگرێتە بەر هەروا ڕەها نییە، بـەڵکو پێویسـتە بـەو کـارەی کە دەیکات مەبەستی هێنانەدی بەرژەوەندی گشتی خەڵك بێت، یـان مەبەسـتی لادانی زیانێك بێت لێیان، بەڵام بەمەرجێك کە ئەو کـارەی کـە دەیکـات (و ئـەو بڕیـارەی کــە دەیــدات) دژی دەقێکــی شــەرعی یــان بڕیــارێکی قــەتعی نەوەستێتەوە)).

## هەروەها لە بڕیاری دادگای کارگێڕیش لە ساڵی (١٩٩٧ز)دا هاتبوو کە:

((ناکرێت ئـەو بڕیـارەی کـە وەزیـر دەری کـردووە بـە پێچـەوانەی دەسـتوور دابنرێت. بەوپێیەی کە خەتەنـە کـردن کـارێکی نەشـتەرگەریە، وشـەریعەتیش هیچ بڕیارێکی وەهای تێدا نییە کە بە واجیبی دابنێت، بۆیە ئەصڵ وەهایە کە ئەنجام نەدرێت، مەگەر بە مەبەستی چارەسەرکردن)).

((نەشتەرگەریش _ هەرچۆنێك بێت وچەندە گەورە بێت _ ئەگەر هۆیەکی وەها نەبوو بۆ ئەنجام دانی بە تەواوی مەرجەکا نییەوە، ئەوا بە کارێکی قەدەغە وحەرام دادەنرێت لە شەرع ولە یاساشدا، ئەمەش وەك پابەند بوونێك بەو بنەما گشتیەی کە باس لە مافی مرۆڤ دەکات لەڕووی سەلامەتی لاشەیەوە، دەبێت هەموو کردەوەیەکیش کە شەرع بە ڕەوای دانەنابێت، ئەگەر مەترسی هەبوو لەسەر سەلامەتی لاشە، ئەوە دەبێت ئەو کردەوەیەش بە تاوان دابنرێت)).

ئەمەی کە باسمان کرد سەبارەت بە وڵاتی میصر بوو، سەبارەت بە وڵاتە ئیسلامیەکانی تریش، ئەوەیە کە ئەوانیش مێیینە خەتەنە ناکەن، وەك شانشینی سعودییە بۆ نموونە.

بەڵکو ئەم پەرچدانەوە کورتە لەسەر ئەم گومانەش وا بکات کە چی تر لەمەولا کەس لێی تێك نەچێت، وئەو تێگەیشتنانەیش ڕاست بکاتەوە کە زیاتر بۆ پروپاگەندە بەکار دەهێنرێت، وهیچ ویژدانێکیشی تێدا نییە.

جا هەرچۆنێك بێت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کچە بەڕێزەکانی خۆی خەتەنە نەکردووە.[1]

---

(١) ئەوەی کە لێرەدا جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە مامۆستای دانەر باسی بۆچوونی هیچکام لە زانایانی نەکردووە، بەڵکو مەسەلەکەشی بەو جۆرە باس کردووە کە تەنها عادەتێك بووە وهیچی ترا، بەڵام ئەگەر بگەڕێینەوە سەر کتێب وسەرچاوە بڕواپێکراو ومتمانەدارەکانی فیقهی ئیسلامی لە هەر چوار مەزهەبەکە، ئەوا دەبینین کە زانایان لەم مەسەلەیەدا ڕاو بۆچوونی خۆیان هەیە، کە سەرچاوەی لە قورئان وفەرموودەکانی حەزرەتەوە (صلى الله عليه وسلم) وەرگرتوە، بۆیە بە پێویستی ئەزانم کە بۆچوونی هەندێکیان لێرەدا باس بکەم، بۆ ئەوەی کە مەسەلەکە زیاتر ڕوون بێت، وبواری پرسیاری تریش نەمێنێت:

* زۆربەی زانایانی مەزهەبی شافیعی وهەندێك لە حەنبەلیەکان دەفەرموون: خەتەنە کردن واجیبە بۆ نێرینە ومێیینەش.
* زۆربەی زانایانی مەزهەبی حەنبەلی وهەندێك لە شافیعیەکان دەفەرموون: خەتەنە کردن بۆ نێرینە واجیبە، وبۆ مێیینەش ڕێز لێگرتن وچاکە لەگەڵ کردنە. -

- ★ زانایانی هەردوو مەزهەبی مالیکی وحەنەفی دەفەرموون: خەتەنە کردن سونەتە بۆ نێرینە ومێیینەش.
★ هەندێکیش لە زانایان فەرموویانە: بۆ نێرینە سونەتە، وبۆ مێیینەش ڕێز گرتن وخزمەت کردنە، چونکە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: (الختان سنة للرجال مكرمة للنساء) بەڵام زانایان فەرموویانە: ئەم فەرموودەیە بێ هێزە. (بڕوانە: تلخيص الحبير/ ٤/ ٨٢)

زانایانی کۆمەڵەی یەکەم بەڵگەیان بۆ بۆچوونەکەی خۆیان هێناوەتەوە بە پشت بەستن بە فەرموودەیەکی صەحیحی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێت) کە ئیمامی بوخاری وموسلیم گێڕاویانەتەوە، کە دەفەرموێت: ((حەزرەتی ئیبراهیم (پێغەمبەر) لە تەمەنی هەشتاساڵیدا خەتەنەی کردووە)).. وە خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا فەرمانمان پێ دەکات کە بکەوینە شوێن ئاینەکەی حەزرەتی ئیبراهیم ﴿ فاتبعوا ملة ابراهيم حنيفا ﴾، کە ئەم ئایەتە دەبێت بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە هەر شتێك کە لەسەر ئەو واجیب بووبێت ئەوە لەسەر ئێمەش هەر واجیبە، مەگەر بەڵگەیەکی وەها هاتبێت کە کردبێتی بە سونەت، وەکو سیواك، وە ئیمامی خەطابی دەفەرموێت ئەو سیفەتانەی کە لە فیترەتی مرۆڤەکانن (وەکو: کورت کردنەوەی سمێڵ، وتاشینی مووی بەر، ونینۆك کردن، ومووی بن هەنگڵ دەرکێشان، وخەتەنە کردن)، هەموویان واجیب بوون لەسەر حەزرەتی ئیبراهیم. (بڕوانە: کتێبی: (المجموع شرح المهذب)ی ئیمامی نەوەوی/ ١/ ٣٤٨)

هەروەها فەرموودەیەکی تری حەزرەتیان هێناوە کە باسی خۆ شۆردن دەکات لە کاتی بەیەك گەیشتنی دوو ئەندامە خەتەنە کراوەکە (إذا التقى الختانان وجب الغسل)، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەردوو ڕەگەز هەر خەتەنە کراون.

ئەوجا لە باسکردن وتاوتوێ کردنی بەڵگەی تەواوی زانایاندا قسەوباس زۆرە. بۆیە لێرەدا هەر ئەمەندە بەسە، وهەر کەسێکیش زیاتری بوێت دەتوانێت بگەڕێتەوە لای سەرچاوە فیقهییەکان.

بەڵام بڕیاری شەرع لەم بارەیەوە هەرچۆنێك بێت (واجب، یان سنة، یان مكرمة)، گومانی تێدا نییە وبەپێی بۆچوونی زۆرێك لە زانایان: کردنی خەتەنە بۆ ئافرەت بەو شێوەیەی کە شەرع دەفەرموێت، وبەپێی ڕێنموویيە پزیشکیەکان، سوود وقازانجی هەم بۆ ئافرەتەکە خۆی وهەم بۆ کۆمەڵگەش تێدایە. (بۆ زیاتر شارەزایی بڕوانە: الإعجاز الطبي في القرآن/ د. السيد الجميلي/ ٢٥٤ – ٢٥٥، وبناء الأسرة المسلمة/ خالد عبد الرحمن العك/ ٤٥٩، وحقوق الإنسان في القرآن والسنة/ د. محمد الصالح/ ٢١٣ – ٢١٤) (وەرگێڕ)

# بەشی حەوتەم

# مافە سیاسیەکانی ئافرەت

موسوڵمانان لە مێژووی خۆیاندا، نە لەکاتی ئەوپەڕی شکۆیاندا ونە لە کاتی ئەوپـەڕی لاوازی وبێهێزیشـیاندا، مەسـەلە وبابـەتێکیان نەناسـیوە بـە نـاوی: (بـاس وکێشـەی ئـافرەت)، نـە لـە ڕووی کارکردنـەوە، ونـە لـە ڕووی بەشـداری سیاسـیانە ونـە لـە هـیچ لایـەنێکی تریشـەوە، بـەلام لـە کاتێکـدا کـە ڕۆژئـاوا نەخۆشی وکێشەکانی خۆیان گواستەوە بۆ هەموو دونیا _ بە موسوڵمانانیشەوە _ ئـەو کاتـە شـتێك دەرکـەوت بـە نـاوی (کێشـە وبابـەت ودۆسـیەی ئـافرەت)، چونکە تاوەکو ئەو کاتەش بابەتێکی لەو جۆرە بوونی نەبوو. ئەوجا دەست کرا بە بانگەواز وداوای ئازاد کردنی ئافرەت _ کە خۆی بۆ خۆی هەر ئازاد بووە _ کـرا لـە زۆرێـك لـە کۆمـەڵگای موسـوڵمانەکاندا، ویسـتیان ئـەو چـەمکە تـازە ڕۆژئاواییانە بۆ ئێمـەش بگوازنـەوە _ کە ئـەو چـەمکانە بەرپەرچـە کردارێك بوون بۆ سەردەمانێکی تاریك کە ئـەورووپای تێدا دەژیا _ دەیانـەوێت ئێمـەی لەسـەر دادگـایی بکـەن، وچـەمکی ئـازاد کـردن بـەلای عـەلما نییـەتی ڕۆژئـاواوە بسەپێنن بەسەرماندا.

جا کۆدەنگیەك هەیە لە نێوان زانایانی ئوصول وتەفسیر وفیقـه وحـەدیس لەسـەر ئـەوەی کـە نێرینـە ومێیینـە هـەردووکیان وەکـو یـەك موکەلـەفن وبەرپرسـیارێتی ڕوویـان تێـدەکات، بـەڵکو فەرمووشـیانە: هـەموو ئـەو دەقـە شەرعیانەی کە ڕوو لە پیاوان دەکەن، لە هـەمان کاتیشدا ڕوو لـە ئافرەتانیش دەکەن، لە تەواوی بڕیار وئەرك وپەند (و ئامۆژگاریەکاندا)، بەلام بە مەرجێك کە ئەو خیتابە کۆت (تقیید) نەکرابێت بەو تایبەتمەندیانـەی کـە پەیوەنـدیان بە پێکهاتەی پیاو یان ئافرەتەوە هەیە، بە مەرجێکیش کە لە خیتابەکە خۆیدا

بە ڕاشکاوی نەهاتبێت کە ئەو خیتابە تایبەتە بە پیاوان نەوەك ئافرەتان، یان بە پێچەوانەوە.

پێ دەچێت (أم سلمة) ڕوون ترین نموونە بێت بۆ ئەم جۆرە تێگەیشتنە. ئەوەتا عەبدوڵای کوڕی ڕافیع دەفەرموێت: (أم سلمة) گێڕایەوە کە (کەنیزەکێك) قژی (بۆ) شانە دەکرد، لەو کاتەدا گوێی لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو کە لەسەر مینبەرەکە دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە. ئەمیش فەرمووی بە کەنیزەکەکەی: جارێ لێم گەڕێ، ئەویش پێی وت: خۆ بانگی پیاوانی کرد، نەك ئافرەتان. (أم سلمة)یش فەرمووی: منیش هەر خەڵکم (واتە هۆ خەڵکینە منیش دەگرێتەوە)

جا سەبارەت بە یاسای وڵاتی (مصر) _ وەکو نموونەیەك بۆ یاسای وڵاتە ئیسلامیەکان _ مافە سیاسیەکان بەو مافانە دادەنێت کە لە یاسادا هاتوون، ودانیان پێدا نراوە بۆ ئەو کەسەی کە سەر بەو وڵات ونیشتمانەیە، زۆر جار یاسادانەر هەبوون وخاوەنداریێتی ئەم مافانە دەبەستێتەوە بە مەرجی (بوونی) ڕەگەزنامەوە. بەو واتایەی کە ئەم مافانە نادرێت بە کەسێك، مەگەر خەڵکی ئەو وڵاتە بێت، بۆیە بێگانە ئەم مافانەی نییە.

نموونەی ئەو یاسایانەی کە باسی ئەم مافانەیان کردووە، وەکو دەقی مادەی یەکەمی یاسای (مباشرة الحقوق السياسية في مصر)ی ژمارە (٧٣)ی ساڵی (١٩٥٧ز) کە ئەمە دەقەکەیەتی: ((هەموو هاووڵاتییەکی میصری، نێرینە بێت یان مێیینە، تەمەنی گەیشتبێتە هەژدە ساڵی زاینی، دەتوانێت مافە سیاسیەکانی خۆی بەکار بهێنێت)).

هەروەها لە مادەی پێنجەمی یاسای ئەنجوومەنی گەلی ژمارە (٣٨)ی ساڵی (١٩٧٣)ی هەموار کراو بە یاسای ژمارە (١٠٩)ی ساڵی (١٩٧٦)، مادەی شەشەمی یاسای ئەنجوومەنی ڕاوێژکاری ژمارە (١٢٠)ی ساڵی (١٩٨٠)، مادەی (٧٥)ی یاسای فەرمان ڕەوایی خۆجێیی (الحكم المحلي) ژمارە (٤٣)ی ساڵی (١٩٧٩) دا هاتووە

کە: ((بەمەرج گیراوە بۆ خۆپاڵاوتن، یان دامەزراندن لەو ئەنجوومەنانە، کە کەسەکە ڕەگەزنامەی میصری هەبێت)). هەروەك لە دەستووری ئێستاشدا لە مادەی حەفتا وپێنج (٧٥)دا هاتووە کە: ((بەمەرج گیراوە بۆ ئەو کەسەی کە هەڵدەبژێررێت بۆ سەرۆکی کۆمار، کە دەبێت دایك وباوکی ڕەگەز نامەی میصریان هەبێت))[١].

جا ئێمە دەکرێت کە نیشانەکان ولایەنە دیارەکانی مافە سیاسیەکان لە کۆمەڵگای موسوڵمانانـدا بە شێوەیەکی گشتی لەم چەند خاڵەدا کورت بکەینەوە:

---

(١) هەروەها لە وڵاتی عێراقیشدا: لە دەستووری ساڵی (٢٠٠٥ز)دا لە چەند مادە وبڕگەیەکدا باسی ئەم مافانەیان کردووە بۆ ئافرەت، وەکو:
- لە مادەی (٢٠)دا هاتووە کە: هاوڵاتیان پیاوان وژنان مافی بەشداری بوونیان هەیە لە کاروباری گشتیدا، هەروەها سوود مەند بوون لە مافە ڕامیاریەکان، بە مافی دەنگدان وهەڵبژاردن وخۆپاڵاوتنیشەوە.
- لە مادەی (٤٧)دا لە بڕگەی یەکەمدا دەڵێت: ئەنجوومەنی نوێنەران لە ژمارەیەك ئەندام.... پێکدێت. وئیتر بە ڕەهایی وبە بێ باس کردنی ڕەگەز. وە لە بڕگەی چوارەمیشدا دەڵێت: یاسای هەڵبژاردنەکان هەوڵی دابین کردنی ڕێژەیەکی نوێنەرایەتی بۆ ئافرەتان دەدات کە لە چواریەکی ئەندامانی نوێنەران کەمتر نەبێت. جا ئەم ڕێژەیە هیچ یەکسا نییەکی تێدا نییە بۆ ئافرەتان، بەڵام بۆ واقیعی ئێستای عێراق گونجاوە.
- لە مادەی (٦٥)دا باس لە مەرجەکانی پاڵێوراو دەکات بۆ پۆستی سەرۆك کۆمار، کە لە بڕگەی یەکەمدا دەڵێت: لە عێراق لە دایك بوو بێت ودایك وباوکی عێراقی بن
- لە مادەی (٧٤) لە بڕگەی یەکەمدا باس لەوە دەکات کە مەرجەکانی پاڵێوراو بۆ سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران هەر هەمان مەرجەکانی پاڵێوراون بۆ سەرۆك کۆمار، وچەند مەرجێکی تریش، کە مەسەلەی ڕەگەزیان تێدا نییە. وە لە بڕگەی دووەمیشدا باس لە مەرجەکانی وەزیر دەکات کە هەمان مەرجەکانی پاڵێوراوانی ئەنجوومەنی نوێنەرانە.

وە لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستانی عێراقیشدا کە پەرلەمانی کوردستان لە بەرواری/ ٢٤/ ٦/ ٢٠٠٩ز پەسەندی کردووە، لە مادە (٢٠)دا کە باس لە یەکسانی دەکات لە سێ بڕگەدا ئەو مافانەی تێدا باس کراوە.

١. هەڵبـژاردن وڕازی بـوون بـە فـەرمانڕەوا. کـە ئەمـە لـە بەرهـەم وکتێبـە فیقهیەکانـدا پێی دەوترێت: بەیعەت کردن (**البیعة**).
٢. بەشـداری کردنـی گشـتی لـەو مەسـەلە وبابەتانـەی کـە تایبەتمەنـدن بـە تەواوی گەل ومیللەتەوە. کە ئەمەش ئەو بنەمای ڕاوێژکاریەیە کە ئیسلام زۆر (سوورە لەسەری و) هانمان دەدات لە سەری.
٣. گرتنە دەستی پلە وپۆستە سیاسیەکانی حکوومەت ودەزگا ودامەزراوەکانی دەوڵەت.
٤. ئامۆژگاری کردنی فـەرمان ڕەوا، وفـەرمان پـێ کردنـی بـە چاکە، وئاگـادار کردنەوە ونەهی لێ کردنی لە خراپە.

وە ئاینی ئیسلام جیاوازی نەکردووە لە نێوان پیاو وئافرەتدا لە تەواوی ئەم مافانەدا کە باسمان کردن، وەکو لەم باسانەدا زیاتر ڕوون دەبێتەوە:

## یەکـەم: هەڵبـژاردن وڕازی بـوون بـە فـەرمانڕەوا. کـە لـە بەرهەم وکتێبە فیقهیەکاندا پێی دەوترێت (البیعة).

خوای گەورە لە زیاد لە شوێنێکدا بە شێوەیەکی گشتی وبێ تایبـەت کـردن بە پیاوان یان ژنان، باسی لـە بەیعـەت کـردووە. وەك دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ۚ﴾ الفـتح/ ١٠. ((واتـە: بەڕاسـتی ئـەو کەسـانەی کـە پـەیمانی مردنیـان پێـدایت ـ کـە ئەگـەر بـێ بـاوەڕانی مەککـە عوسمانیان شەهید کردبێت، ئەوە بۆ تۆڵە وەرگرتنەوە هێرش بکەنـە سـەریان ـ ئەوانە بەو پەیمان بەستنەیان لەگـەڵ تـۆدا، پـەیمانیان لەگـەڵ خـودا بەسـتووە، دەستی خودا لە سەرووی دەستی ئەوانەوەیە))

هـەروەها باسـی بەیعـەت کردنـی ئافرەتانیشـی کـردووە، وەك دەفـەرموێت:
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى

مَعۡرُوفٖ فَبَايِعۡهُنَّ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُنَّ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ الممتحنة/ ١٢. ((واتە: ئەی پێغەمبەر، ئەگەر ئەو ئافرەتانەی کە ئیمانیان هێناوە هاتن بەیعەتت بدەنێ، لەسەر ئەوەی کە تەنها خودا بپەرستن ووێنە وهاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن، دەست پاك بن ودزی نەکەن وخۆیان لە داوێن پیسی وبەدڕەوشتی بپارێزن، ومنداڵەکانیان نەکوژن - وەك پێش هاتنی ئاینی ئیسلام هەندێك کەس کچی خۆیان زیندەبەچاڵ دەکرد، یان هەر وەکو ئەوەی هەندێك ئافرەت کە سکیان پڕ دەبوو سکەکەیان لەبار دەبرد - هەروەها پەیمانت بدەنێ لەسەر ئەوەی کە منداڵی کەسێکی تر بە درۆ بە منداڵی خۆیان دانەنێن وبڵێن: ئەم منداڵە لە من بووە، هەروەها بەڵێنت بدەنێ کە لە جێبەجێ کردنی هەموو فەرمانێکی خێرت دوانەکەون وبە جوانی ئەنجامی بدەن، ئەوە - ئەی پێغەمبەر - تۆیش لەسەر ئەو شتانە بەیعەتیان لێ وەربگرە وداوای لێخۆشبوونیان لە خودا بۆ بکە، بێ گومان خودا زۆر لێخۆشبوو خاوەن بەزەییە)).

کەواتە قورئانی پیرۆز ئەوەی سەلماندوە کە ئافرەتیش وەکو پیاو بە تەواوەتی مافی ئەوەی هەیە کە بەیعەت بکات بە فەرمان ڕەوا، دەنگیشی هەر هەمان دەنگی پیاوانە، بە بێ جیاوازی.

## دووەم: بەشداری کردنی گشتی لەو مەسەلە وبابەتانەی کە تایبەتن بە تەواوی گەل ومیللەتەوە. کە ئەمەش پێی دەوترێت: بنەمای ڕاوێژکاری (مبدأ الشوری).

ئاینی ئیسلام زۆر هانی ئەوەی داوە کە ئەم بنەمایە لە نێوان کاربەدەست وژێردەستەکاندا پەیڕەو بکرێت، وهیچ جیاوازیشی نەکردووە لە نێوان پیاو وئافرەتدا لەم مەسەلەیە، لە زیاد لە جێگەیەکی قورئانی پیرۆزدا پەروەردگارمان ئێمەی ڕێنموویی کردووە بۆ ئەم کارە، وەکو لە باسی سیفەتە باشەکانی موسوڵمانانندا دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ

شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ الشورى/ ٣٨. ((واتە: هەروەها ئەوانە ئەو كەسانەن كە لە ئاستی فەرمان وبڕیارەكانی خودای پەروەردگاریاندا ملكەچن، وبە دڵێكی بێدارەوە وبە ڕێكوپێكی نوێژەكانیان بە ئەنجام دەگەیەنن، تەنها بەپێی ئارەزووی خۆیان كاروباری وڵات ومیللەت بەڕێوە نابەن، ولە خۆیانەوە بڕیاری لەسەر نادەن، بەڵكو پرس وڕاوێژ دەكەن، وڕاو تەدبیری خاوەن ڕایان وەردەگرن، لەو ماڵ وسامانەی كە بەشمان داون، بەشی هەژار ودەستكورتانی لێ دەدەن، ولە كۆمەڵگادا كەسانی چاكەكار وبە كەڵكن)).

خوای گەورە فەرمان دەكات بە پێغەمبەرەكەی، كە لەو سەردەمەدا كاربەدەست وفەرمان ڕەوای موسوڵمانان بووە، وەك دەفەرموێت: ﴿فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ﴾ آل عمران/١٥٩. ((واتە: تۆ لە هەڵەكانیان ببوورە، وچاوپۆشی بكە، ولە خودا داوای لێخۆشبوونیان بۆ بكە، بۆ هەر كاروبارێك پرس وڕاوێژ بە هاوەڵەكانت بكە)).

پێغەمبەریش ڕاوێژی كرد بە (ام سلمة)ی خێزانی، لە مەوقیف وبارودۆخێكی زۆر دژواردا، لە ڕێكەوتن نامەی حودەیبیەدا، پاش ئەوەی كە پەیمان نامەی ڕێكەوتنەكە لەگەڵ موشریكەكاندا نوسرایەوە، پێغەمبەر فەرمانی دا بە موسوڵمانان كە هەستن بە سەربڕینی حەیوان وقژی خۆشیان كورت بكەنەوە، چونكە ئەم ساڵ ناچن بۆ شاری (مكة). كەچی یەك كەسیان هەڵنەسان.

جا ئیمامی عومەر ئەمەمان بۆ دەگێڕێتەوە، ودەفەرموێت: ((كاتێك كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە نووسینەوەی نوسراوەكە بوویەوە، فەرمووی بە هاوەڵەكانی: (هەستن حەیوان سەر ببڕن، وپاشان قژیشتان بتاشن). جا دەفەرموێت: سوێند بە خوا یەك پیاو هەڵنەسا. هەتا پێغەمبەر سێ بارەی كردەوە. ئەوجا كە كەس هەڵنەسا، پێغەمبەریش چووە ژوورەوە بۆ لای (ام سلمة) وباسی ئەوەی بۆ كرد كە لەو خەڵكە بینی. (ام سلمة)ش پێی فەرموو:

ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوەت پێ خۆشە؟ بچۆرە دەرەوە ویەك وشە قسە لەگەڵ کەسدا مەکە، تاوەکو حوشترەکەی خۆت سەردەبڕیت، ونەوجار بانگ بکە باسەرتاشەکەت سەرت چاك بکات. ئیتر پێغەمبەریش چوە دەرەوە، وقسەشی لەگەڵ کەسدا نەکرد، هەتا کارەکەی ئەنجامدا: حوشترەکەی سەربڕی وبانگی سەرتاشەکەشی کرد، ونەویش سەری بۆ چاك کرد. جا کاتێك کە هاوەڵان ئەمەیان بینی، هەستانەوە ئەوانیش حەیوانی خۆیان سەربڕی ودەستیان کرد بە سەرچاك کردنی یەکتری (لە هەندێك لە ڕیوایەتەکاندا دەفەرموێت: لە غەمباری وبێ تاقەتیدا خەریك بوو یەکتری سەر ببڕن)).[1]

لەم سەردەمە تازەی ئێمەشدا زانایانی ئیسلام ڕێگریان نەکردووە لە هەڵبژاردنی ئافرەت بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرایەتی، ونوێنەرایەتی کردنی چین وتوێژێکی فراوانی گەل، وبەشداری کردن لە دانان ودارشتنی ئەو یاسایانەی کە بۆ ڕێکخستنی کاروباری خەڵك دادەنرێن. ئەوەتا خانەی فەتوادانی ولاتی (مصر) فەتوای ژمارە (٨٥٢)ی ساڵی (١٩٩٧ز) دەر کرد سەبارەت بە بڕیاردان لەسەر درووستی بە ئەندام بوونی ئافرەت لە ئەنجوومەنی نوێنەران، یان گەل، کە پووختەی فەتواکە ئەمەیە: هیچ ڕێگرێکی شەرعی نییە بۆ بە ئەندام بوونی ئافرەت لە ئەنجوومەنەکانی نوێنەران وگەڵدا، ئەگەر خەڵك ڕازی بن بەوەی کە ئافرەت نوێنەرایەتیان بکات لەو ئەنجوومەنانەدا، بەمەرجێکیش کە مواسەفاتی ئەو ئەنجوومەنانە گونجاو بێت لەگەڵ ئەو سرووشتە تایبەتەی ئافرەت کە خوا پێی داوە، دەبێت ئەو ئافرەتە لەو جێگایانەدا پابەند بێت بە سنوورەکانی شەرعی خواوە، بەو جۆرەی کە خوای گەورە لە شەریعەتی ئیسلامدا دیاری کردووە وفەرمانی پێ داوە.

---

(١) البخاري/ كتاب الشروط/ باب الشروط في الجهاد والمصالحة مع أهل الحرب وكتابة الشروط/ ٢٥٨١، والطبراني في المعجم الكبير/ باب الميم/ من اسمه مسور/ ١٣، وعبد الرزاق في مصنفه/ كتاب المغازي/ غزوة الحديبية/ ٩٧٢٠، والبيهقي في السنن الكبرى/ كتاب الجزية/ باب المهادنة على النظر للمسلمين/ ١٨٥٨٧.

## سێیەم: گرتنە دەستی پلە وپۆستە گرنگەکانی حکوومەت ودەزگا ودامەزراوەکانی دەوڵەت.

گێڕانەوەیەکی زۆر هاتووە لەبارەی گرتنە دەستی دەسەڵاتی جێبەجێ کردن یان پۆلیسی یان ئەوەی کە لە کتێبە فیقهیەکاندا پێی دەوترێت: (**الحسبة**)، لە لایەن ئافرەتەوە، ئەویش لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا.

جا هەر لەسەر ئەو گێڕانەوانەش هەندێك لە زانایانی ئیسلام بە درووستیان داناوە کە ئافرەت ئەم پۆست وپایە هەستیارەی دەسەڵات وپێشەنگی لە وڵاتی ئیسلامیدا بگرێتە دەست. ئەوەتا لە کتێبی (**الموسوعة الفقهية**)دا هاتووە: ((کەسانێکی تر ڕێگەیان بەم کارە داوە، چونکە نەگێڕنەوە کە سەمرائی کچی شوهەیکی ئەسەدی[1] کاتی خۆی بە بازاڕدا تێدەپەڕی، وفەرمانی دەکرد بە چاکە ونەهی دەکرد لە خراپە، بەو قامچییەی کە بە دەستیەوە بوو.))[2]

ئەم هەواڵەی سەمرائیش یەحیای کوڕی ئەبو سولەیم گێڕاویەتیەوە، کە دەفەرموێت: ((سەمرائی کچی نوهەیکم بینی، کە بە خزمەتی پێغەمبەر گەیشتبوو (واتە: لە ڕیزی هاوەڵان دەژمێررا)، جل وبەرگێکی ئەستووری پۆشی بوو، پەچەیەکی ئەستووریشی کردبوو، قامچییەکیشی پێ بوو کە خەڵکانی پێ تەربێت ئەدا، وفەرمانی دەکرد بە چاکە ونەهی دەکرد لە خراپە.))[3]

هەروەها لەسەر وتەی هەندێك لە زانایانی متمانەداریش، درووستە کە ئافرەت کاری دادوەری بگرێتە دەست، ئەوەتا ئیمامی ئەبو حەنیفە و

---

(١) ڕاستیەکەی ئەوەیە کە (سەمرائی کچی نوهەیکە).

(٢) الموسوعة الفقهية الكويتية/ ١٧/ ٢٤١/ حرف الحاء/ حسبة.

(٣) الطبراني في المعجم الكبير/ مسند النساء/ باب السين/ سمراء بنت نهيك/ ٧٨٥، وذكره ابن عبد البر في الاستيعاب/ ٤/ ١٨٦٣، والهيثمي/ في مجمع الزوائد/ ٩/ ٢٦٤، وعزاه إلى الطبراني، ثم قال: رجاله ثقات.

هاوەڵەکانیشی پێیان وایە: ئافرەت درووستە کاری دادوەری بگرێتە دەست لە هەموو ئەو کارانەی کە دەکرێت تیایاندا ببێت بە شایەت، ئیتر بە تەنها، یان لەگەڵ پیاواندا. چونکە شایەتی دانیش هەر مانای ویلایەت وسەرپەرشتیاری تێدایە. شێخی ئیبنو حەجەر ئەمەی باس کردووە، وەك دەفەرموێت: ((ڕێگە نەدان بەوەی کە ئافرەت کاربەدەستی ودادوەری بگرێتە دەست، ئەوە وتەی زۆرینەی زانایانە، بەلاّم (طبري) ڕێگەی پێداوە، کە ئەمەش یەکێکە لەو ڕیوایەتانەی کە لە ئیمامی مالیکەوە گێڕاویانەتەوە، بەلای ئیمامی ئەبو حەنیفەشەوە: ئافرەت فەرمان ڕەوایی (و دادوەری) دەگرێتە دەست لەو کارانەی کە درووستە ببێت بە شایەت تێیاندا))[1]

ئەوجا ئەوەی کە باسمان کرد ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە چۆن ئافرەت هەم لە واقیعی عەمەلی موسوڵماناندا وهەم لە کتێب وبەرهەمە فیقهیەکانیشدا هاتووە کە پۆست ودەسەلاّتە گرنگە حکوومیەکانی[2] گرتۆتە دەست، لەم

---

(١) فتح الباري لابن حجر العسقلاني/ ٨/ ١٢٨، قوله باب كتاب النبي صلى الله عليه وسلم إلى كسرى وقيصر.

(٢) لەبەر ئەوەی کە لەم نوسراوەی مامۆستای دانەردا گومانێك درووست دەبێت لەسەر ئەوەی کە گوایە ئافرەت بۆی هەیە هەموو کارێکی حکومی ودەسەلاّت بگرێتە دەست، لە ناویاندا: سەرۆکی کۆماری یان پاشایەتی، کە ئەم کارەیان زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە درووست نییە. چونکە وەکو ئیمامی بوخاری وزۆرێکی تریش لە زانایان بۆمان دەگێڕنەوە: کاتێك کە هەواڵیاندا بە حەزرەتی پێغەمبەر کە فارسەکان لە پاش کیسری کچەکەیان کردووە بە پاشای خۆیان، ئەویش فەرمووی: (لن يفلح قوم ولوا أمرهم امرأة) واتە: ئەو گەل وهۆزە بەختەوەر وسەرکەوتوو نابن کە کاروباریان بدەنە دەست ئافرەت.، بەلاّم کارەکانی تری هەر لە وەزارەتەکانەوە تاوەکو پارێزگاری وقائیمقانی وبەڕێوەبەری ناحیە ودادوەری وبەرپرسیارێتی هەر جۆرە بەڕێوەبەرایەتیەك، هەموو ئەمانە دەرفەتێکیان تێدایە لە شەرعدا بۆ ئەوەی کە ئافرەت ڕۆڵیان تێدا ببینێت، بەلاّم سەرکردایەتی ولاّت جیاوازی هەیە، هەم لە ڕووی سیاسیەوە وهەم لە ڕووی دینیشەوە. بۆ زانیاری زیاتر دەتوانرێت تەماشای ئەم سەرچاوانە بکرێت: (المرأة بين طغيان النظام الغربي ولطائف التشريع الرباني/ د. محمد سعيد رمضان البوطي/ ٦٩ – ٨١، والمرأة بين الفقه والقانون/ الدكتور مصطفى السباعي/ ٣٩ – ٤١، وشخصية المرأة المسلمة في ضوء =

سەردەمەی ئێمەشدا دەبینین کە ئافرەت بەشداری پیاو دەکات _ لە زۆرینەی ولأتە ئیسلامی وعەرەبیەکاندا _ لە هەموو کارە دەوڵەتیەکان، ولە ژیانی سیاسی وزانستیشدا، ئەوتا چەندەها ساڵە دەبینین کە ئافرەت: سەفیرە ووەزیرە ومامۆستای زانکۆیە ودادوەرە. لەگەڵ پیاوانیشدا یەکسانن لەڕووی پاداشت و مووچەی پیشەکەیان، لە هەموو ئەو کارانەدا.

## چوارەم: ئامۆژگاری کردنی فەرمان ڕەوا، وفەرمان پێ کردنی بە چاکە، ونەهی لێ کردنی لە خراپە.

ئامۆژگاری کردنی ئافرەتان بۆ کاربەدەستانی ولأت، وقسەی ڕاست کردن لە بەرامبەریان، هەر زوو لە سەدەی یەکەمی کۆچییەوە، لەو سەردەمە پڕخێرەدا دەستی پێ کرد.

ئەوەتا لە سەردەمی خەلیفایەتی عومەردا، وەکو قەتادە بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ((ئیمامی (عمر) لە مزگەوت دەرچوو، کەسێکی لەگەڵدا بوو بە ناوی (**الجارود العبدي**)، ئەوجا گەیشتن بە ئافرەتێك لەسەر ڕێگەکەیان، و ئیمامی عومەر سەلامی لێ کرد، وئەویش وەلأمی سەلامەکەی دایەوە، و(بە سەرسووڕمانەوە) وتی: هێی عومەر کاتێ من تۆم بینی پێیان دەوتی (**عمیر**) (واتە: عومەرە بچکووکەکە، چونکە منداڵ بووە)، لە بازاڕی (**عکاظ**) گاڵۆکێکت پێ بوو، (شوانی مەڕ بوویت) مەڕت ئەلەوەڕاند (لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە کە: گاڵۆکێکت پێ بوو، منداڵت پێ ئەترساند)، ئەوجا پاش ماوەیەك پێیان دەوتیت: (عمر)، پاش ماوەیەکی تر ناوت لێ نرا: پێشەوای ئیمانداران. جا لە خوا بترسە سەبارەت بەو خەڵکەی کە لە ژێر دەستت دان، ئەوەش بزانە کە

---

* الکتاب والسنة/ خالد عبد الرحمن العك/ ٢٦٦ — ٢٧١، وشبهات وإجابات حول مكانة المرأة في الإسلام/ الدكتور محمد عمارة/ ٢/ ٨٠ — ٨٦، والمرأة بين الشريعة وقاسم أمين/ زكي علي السيد أبو غضة/ ٢٤٦ — ٢٥٥، والمرأة بين الإسلام والقوانين العالمية/ المستشار سالم البهنساوي/ ١١٢ ١٢٦) (وەرگێڕ)

هەر کەسێك لە هەڕەشەی خوا بترسێت، شتە دوورەکانی بۆ نزیك دەبێتەوە، هەر کەسێکیش لە مردن بترسێت، ئەوە ترسی لەناوچوون وفەوتانی لێ دەکرێت))[١].

لە ئەبو نەوفەلەوە هاتووە کە وتوویەتی: ((... پاش کوژرانی عەبدولآی کوڕی زوبەیر، حەجاجی کوڕی یوسوفی (ثقفي) چوو بۆ لای ئەسمائی کچی ئیمامی ئەبو بەکر، وپێی وت: بینیت چیم کرد بەو دوژمنی خوا؟! ئەویش فەرمووی: وا دەبینم کە تۆ دنیات لەو شێواند، بەلآم ئەویش دوارۆژی لە تۆ شێواند، ئاگاداریشبە کە پێغەمبەری خوا پێی فەرمووین: (ان في ثقيف كذابا ومبيرا فأما الكذاب فرأيناه وأما المبير فلا إخالك إلا إياه) واتە: هۆزی (ثقیف) درۆزنێك وویرانکەر (فڕکەر)ێکیان تێدایە، ئێمە درۆزنەکەمان بینی وناسیمان، بەلآم کەسە فڕکەر وفەوتێنەرەکەش، گومانم وایە کە لە تۆ بەولاوە کەسی تر نییە. جا ئەبو نەوفەل دەڵێت: ئیتر حەجاج هەستا وبەجێی هێشت وئیتر جارێکی تر سەردانی نەکردەوە))[٢].

---

(١) الاستيعاب لابن عبد البر/ ٤/ ١٨٣١، والإصابة في تمييز الصحابة لابن حجر العسقلاني/ ٧/ ٦٢٠. لە هەندێك لە سەرچاوەکاندا دەگێڕنەوە کە: جارود وتی بە ژنەکە: بەسە لەسەری مەڕۆ، پێشەوای موسوڵمانانت کردە گریان. ئیمامی عومەریش(خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: ئەو ئافرەتە ناناسیت؟ ئەمە خەولەی کچی (ثعلبة)یە، براژنەکەی عوبادەی کوڕی صامت (خوای لێ ڕازی بێت)، کە خوای گەورە لە ئاسمانەوە گوێی لە قسەکانی گرتوە، کەوابوو عومەریش باشتر دەبێت گوێی لێ بگرێت. بەخوا قەسەم ئەگەر لە بەیانی تاوەکو ئێوارە ڕام بگرێت، ڕادەوەستم، مەگەر بۆ نوێژە فەرزەکان نەبێت. بڕوانە: (تفسير القرطبي/ تفسير سورة المجادلة) (وەرگێڕ)

(٢) مسلم/ كتاب فضائل الصحابة/ باب ذكر كذاب ثقيف ومبيرها/ ٢٥٤٥. ئیمامی نەوەوی لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێت: زانایان یەکدەنگن لەوەدا کە درۆزنەکە کەسێك بووە بە ناوی (المختار بن أبي عبيد)، وە کەسە فڕکەرەکەیش بریتی بووە لە: حەجاجی کوڕی یوسف. (وەرگێڕ)

جا ئەمانە چەند نموونەیەکی کەم بوون، مێژووی ئیسلامیش پڕە لە زۆرێك لە وێنەی وەکو ئەمانە [1]، ئێستاش دەبینین کە ئافرەتیش وەکو پیاو ئەم مافەی بۆ دەستەبەر کراوە لە چەندین کەناڵی ڕێگەپێدراوەوە (کاری خۆیان دەکەن)، وەکو: ڕۆژنامەوانی، یان ئەندامێتی ئەنجوومەنی گەل، یان چەندین کەناڵی تریش ئامۆژگاری حکوومەت دەکەن، وەهەر هەڵەیەکی کردبێت ئاگاداری دەکەنەوە، هەر کارێکی درووستیشی کردبێت، ئیقراری دەکەن (و دەستخۆشی لێ دەکەن).

ئێمەش بە پشتیوانی خوا بەڵکو توانیبێتمان لەو چوار تەومرە وباسەدا توانیبێتمان بە شێوەیەکی کورت وبەسوود مافە سیاسیەکانی ئافرەت ویەکسانیمان لەگەڵ پیاودا بەچاکی ڕوون کردبێتەوە.

---

(١) پێم وایە کە مامۆستای دانەر لە هێنانەوەی نموونەی دووەمدا موەفەق نەبووە، ئەویش لەبەر چەند هۆیەك:

- لەلایەك عەبدوڵای کوڕی زوبەیر کوڕی ئەسمائی کچی ئیمامی ئەبوبەکر بووە (خوا لە هەموویان ڕازی بێت).
- لەلایەکی تریشەوە لەو کاتەدا کە شەهید کرا گەورەی موسوڵمانان بوو، کە خەڵکی عێراق وحیجاز ویەمەن وخۆراسان گوێڕایەڵیان دەکرد، وە پاش شەهید کردنیشی هەڵیان واسیبوو بە دارێکدا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ، ئەوجا لە پاش سێ ڕۆژەکە ئەم گفتوگۆیە لە نێوان دایکی وحەجاجدا ڕووی داوە.
- دایکیشی لەو کاتەدا چاوەکانی لەدەست دابوو، وە پیر بووبوو، تەمەنی گەیشتبووە هەشتا ساڵ، وە داواشی کرد لە حەجاج کە ئایا کاتی داگرتنی لاشەی کوڕە کوژراوەکەی نەهاتووە؟! وە حەجاجیش بە ناشیرینی وەڵامی دایەوە، وتی: ئەوە موونافیقە. ئەویش فەرمووی: سوێند بە خوا موونافق نییە، بەڵکو کەسێکی ڕۆژووگری شەونوێژکەر بووە. ئەویش پێی وت: بڕۆ هەی پیری خەڵەفاو. ئەوجا ئەسما فەرمووی: سوێند بە خوا خەڵەفاو نیم، بەڵکو گوێم لە حەزرەت بوو کە فەرمووی: إن في الثقيف...هتد.

بۆیە زۆر شتێکی سرووشتیە کە دایك لەو جۆرە بارو دۆخەدا هەڵچوون ڕووی تێ بکات، وەهەڵوێستی ئاوەها بنوێنێت بەرامبەر بەو کەسەی کە بەرپرسیارە لە کوشتن وسووکایەتی کردن بە کوڕەکەی. بۆیە ئەگەر نموونەیەکی تری بهێنایەتەوە باشتر بوو. (وەرگێڕ)

# بەشی هەشتەم

## لێدانی ئافرەت لە ئیسلامدا

باسی لێدانی ئافرەت لە قورئاندا لە یەك جێگەدا هاتووە، كە دەفەرموێت:
﴿وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ وَٱضۡرِبُوهُنَّ﴾
النساء/ ٣٤. ((واتە: ئەو ژنانەی كە دەبینن لە ڕێگە لادەدەن وسەرپێچی دەكەن ویاخی دەبن، ئەوە ئامۆژگاریان بكەن، ئەگەر سوودی نەبوو ئەوا لە جێگەی نووستندا لەگەڵیان مەبن - واتە لەگەڵیان مەخەون ومەیانـدوێنن ونارەزووەكانیان بۆ جێبەجێ مەكەن -، ئەگەر ئەوەیش سوودی نەبوو ئەوا لێیان بدەن - بەڵام لێدانێكی بێ زیان -)).

وشەی (نشوز) بریتیە لە سەرپێچی كردنی كۆمەڵایەتی وڕەوشتی، بەوەی كە ئافرەت ئەركەكانی جێبەجێ ناكات، كە ئەو ئەركانە دەبن بە ماف بۆ مێردەكەی، هەروەكو چۆن ئەركەكانی مێردیش دەبن بە ماف بۆ ژنەكەی.

جا لەو سەرپێچی كردنە كۆمەڵایەتی وڕەوشتیەدا خوای گەورە ڕێنموویی پیاوان دەكات كە بە ئامۆژگاری هەوڵ بدەن ژنەكانیان بهێننەوە سەر ڕێگە وڕاستیان بكەنەوە، بەوەی كە قسەی خۆش ونەرمیان لەگەڵدا بكەن، وخوایان بهێننەوە یاد وبە بیریان بخەنەوە، وباسی ئەو مافانەیان بۆ بكەن كە خوا داوای لێ كردوون.

پاشان خوای گەورە ڕێگەی بە پیاو داوە كە بۆ ماوەیەك لە جێگەی خەوتندا لێی جیابێتەوە، وەك فشار خستنەسەرێك بۆ ئەوەی كە ئەركەكانی خۆی جێبەجێ بكات.

هەروەها خوای گەورە ڕێگەی داوە بە پیاو كە لێدانی ژنەكەی بكات، وەك بەدەرخستنی تووڕەیی ونارازی بوون، بەڵام لێدانێكی وەها كە شوێنەواری

لەسەر لاشەی ژنەکە بەجێ نەمێنێت، ئەمەش تەنها وەکو ئەوەی کە پێی بڵێت: من تووڕەم لێت.

ئەم لێدانەش شتێك نییە کە پێویست بێت لەسەر پیاو کە بیکات، بەڵکو تەنها لێدانێکی سووکە، وئەویش لەو حاڵەتەدا. هەر بۆیە تەواوی زانایان فەرمانیان داوە کە دەبێت ئەو پیاوە تاوەکو لە توانایدا هەیە خۆی لە بەکار هێنانی لێدان بەدوور بگرێت، وبە هەر جۆرێکی تر کە بۆی دەکرێت تووڕەیی خۆی بەسەردا دەربڕێت.

هەروەك چۆن پیاویش ئەگەر هەڵەی کرد لە جێبەجێ کردنی مافەکانی ژنەکەیدا، ئەوا لێدان دەکرێت وتەمێ دەکرێت. بۆ نموونە: ئەگەر پیاوێك بە پەنجە هەستێت بە لابردنی پەردەی کچێنی ژنەکەی، ئەوا زانایان (ی مەزهەبی مالیکی) فەرموویانە: ((لابردنی پەردەی کچێنی بە پەنجە تاوانە، ومێردەکەشی لەسەر تەمێ دەکرێت)) [1]

هەروەها کاتێك کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) زۆرێك لە پیاوان دابوویان لە ژنەکانیان، وئەوانیش هانایان بردە لای پێغەمبەر، ئەویش زۆر تووڕە بوو لە هاوەڵەکانی وپێی فەرموون: ئافرەتانێکی زۆر هاتوون، سەردانی خێزانەکانمیان کردووە، وهانایان هێناوە لە دەستی لێدانی مێردەکانیان، ئەو پیاوانە لە باشەکانی ئێوە نین.[2] واتە: لێدانی ژن کاری پیاوی باش نییە!

---

(١) الفقه على المذاهب الأربعة/ عبد الرحمن الجزيري، مبحث الجناية على الأطراف/ ٥/ ٢٤٢.

(٢) أبو داود في السنن/ كتاب النكاح/ باب في ضرب النساء/ ٢١٤٦، والدارمي/ كتاب النكاح/ باب في النهي عن ضرب النساء/ ابن حبان/ كتاب النكاح/ باب معاشر الزوجين/ ٤١٨٩، والحاكم في المستدرك/ كتاب النكاح/ ٢٧٦٥، والشافعي في مسنده/ ومن كتاب الخلع والنشوز/ ١٢٦٢، والطبراني في المعجم الكبير/ باب الألف/ إياس بن عبد الله بن أبي ذباب/ ٧٨٤، وعبد الرزاق في مصنفه/ كتاب العقول/ باب ضرب النساء والخدم/ ١٧٩٤٥، والبيهقي في السنن الكبرى/ كتاب القسم والنشوز/ باب ما جاء في ضربها/ ١٤٥٥٢، والنسائي في السنن الكبرى/ كتاب عشرة النساء/ ضرب الرجل زوجته/ ٩١٦٧. ئەم فەرموودەیە خۆی بەشێکە لە =

کەواتــە ئــەو ســونەتەی پێغەمبــەر (صـلی الله علیـه وسـلم) کـە ئێمــە هــانی موسـوڵمانانی بـۆ دەدەیـن، ئەوەیـە کـە لـە ژنـەکانیان نـەدەن، چونکە هـەرگیز پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە ژنەکانی خۆی نەداوە، بەڵکو کە ڕێگەش دراوە بە لێدان، وەها ڕێگە دراوە کە بە سیواك لێیان بدرێت (واتـە بـە هێواشـی بێـت، ولەجێگەی هەستیاریش نەدرێت)، ئەویش تەنها بۆ ئـەوەی کە تـووڕەیی خـۆی بـۆ دەربخـات، وتێشـی بگەیـەنێت کـە ئـەم ڕازی نابێـت بـەوەی کـە ئـەو هـەر سووربێت لەسەر بێ گوێیی کردن.

هەنـدێك ژینگـە وکۆمـەڵگاش هەیـە کـە ژنـان پێویسـتیان بـە لێـدان هەیـە، خۆشــیان بــە نیشــانەی پیــاوانی مێردەکانیــانی دەزانــن، کــە ئــەم ژینگــە وکۆمەڵگانەش ڕۆژئاوا شارەزایان نییە وهەر ئاگاشی لێیان نییە، بـەڵام قورئـانی پیرۆز بۆ هەموو مرۆڤەکان هاتووە، وبۆ هەموو کات وشـوێنێکیش، وبـۆ هـەموو کەسێکیش هەتاوەکو دونیـا دوایـی دێـت، هـەر بۆیـە بڕیـار وتایبەتمەندیـەکانی قورئان هـەموو ژینگـە وکۆمەڵگە جیاوازەکـان دەگرێتـەوە، کە ئەگـەر ڕەچـاوی بارودۆخ وتایبەتمەندی ئەو کۆمەڵگایانە نەکات، ئەوا دەبێت بە هۆی تێکچوونی ئارامی ناو خێزان، وڕووبەڕووی مەترسی هەڵوەشانەوە ودارمانی هەیە. کەواتـە ئەو ڕێگەدان بە لێدانە ڕێگەیەکە بۆ ڕاست کردنەوە وچاك کردن.

وە ئێمەش ئێستا لەسەر ئەوە نـین کـە مەسـەلەیەکی نـەزەری بـاس بکـەین، ئەوەنـدەی کـە لـە بـەردەم کێشـەو مەسـەلەیەکی واقیعـی و بەرجەسـتەداین. جـــا ئەگەر سەرچاوەکانی شەریعەتی ئیسلامی موسوڵمانانی هەڵبنایە لەسـەر

---

- فەرموودەیــەکی درێــژتر کــە دەگێڕنــەوە پێغەمبــەر فەرموویــەتی: لــە ژنــەکانتان (کەنیزەکـەکانی خـوا) مـەدەن. ئـەوجا ئیمـامی عومـەر (خـوای لێ ڕازی بێـت) هاتـەلای پێغەمبەر و فەرمووی: ژنەکان تەواو بێ ترس بوون لـە مێردەکانیـان وبـە گوێیـان ناکـەن. ئیتر پێغەمبەریش ڕێگەی پێدان کە لێیان بدەن. پاشان ئەوانیش دەستیان کرد بە لێدانیان، ئەوجا پێغەمبەر فەرمووی (لە هەندێك لە ڕیوایەتەکاندا): ئەم شەو حەفتا ژن هاتوون بـۆ لای خێزانەکانم و شکاتی مێردەکانیان کردووە، کە لێیان دەدەن. (وەرگێڕ)

لێدان و ستەم کردن لە ئافرەتان، ئەوا دەبوو ئەو دیاریدەیە لە واقیع وژیانی ڕۆژانەیاندا دەربکەوتایە. ئەگەر هانیشی بدانایە لەسەر بەزمیی وخۆشەویستی، ئەوا ئەویشیان هەر پێوە دەردەکەوت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخۡرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ وَٱلَّذِي خَبُثَ لَا يَخۡرُجُ إِلَّا نَكِدٗا﴾ الأعراف/٥٨. ((واتە: بە فەرمانی خودا ولاتی بە پیت وسەرزەمینی چاك ڕوەك وشینایی ومیوەهاتی لێ دەڕوێت، بەلاَم سەرزەوی خراپ وخوێدار هیچی تێدا شین نابێت، مەگەر شتێکی کەم وبێ کەڵك)).

ئەوجا وەرن باوەکو فەرموودەیەکی عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) بێنینەوە یاد، کاتێك کە فەرمووی: ((پیاوان لە بەروبوومەکانیانەوە دەیان ناسیتەوە، ئایا لە دڕك ترێ دەچنیتەوە؟! یان لە تووڕك هەنجیر؟!))، جا ئەگەر هەڵوێستەیەك بکەین لە بەردەم (لێدانی ئافرت بە سیواك، بۆ دەرخستنی نارەزایی وتووڕەیی)، وئەوجا تەماشایەکی کۆمەڵگای موسوڵمانان بکەین، کە تاوەکو چەند شکات وگلەیی بوونی توندوتیژی لە دژی ئافرەتان هەیە؟ یان چەندە ئازاریان دەدرێت وچەندە لێدان دەکرێن؟ ئەوا دەبینین کە چەند حاڵەتێکی زمێرراوی کەمی دیاری کراوە، کە لە ئەنجامی پابەند نەبوون بە ڕێنموویی وزانیاریەکانی ئەم ئاینەوە پەیدا بوون. چونکە زۆرینەی پیاوان لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا توندوتیژی ولێدان وئازاردان لە دژی ژنان بەکار ناهێنن، بەڵکو لەو کۆمەڵگایەدا پیاوان پارێزگاری لە ژنان دەکەن وچاودێریان دەکەن.

لە بەرامبەریشدا، ئەگەر بمانەوێت واقیع وژیانی ڕۆژئاوا بخوێنینەوە، کە چۆن بە لێدانێکی خراپ وستەمکارانە بە شێوەیەکی بلاّو لێدانی ژنان دەکرێت، ئەوا دەبینین کە هەر سەرژمێریەکانی سەرچاوەکانی خۆیان شایەتی ئەمانەمان بۆ دەدەن:

- (٧٩٪)ی پیاوان لە ژنەکانیان دەدەن بە لێدانێکی وەها کە سەردەکێشێت بۆ بەلاّ و نوقسانییەکی بەردەوام.

- (١٧٪)ی ئەو ئافرەتە لێدراوانە بارودۆخیان وا دەخوازێت کە ببرێنە ژێر چاودێری وردەوە (العناية المركزة).. ئەوەی کە ئەم زانیاریەی نووسیوە بریتیە لە دکتۆر (جون بریە) کە مامۆستای یاریدەدەری مادە ودەرسی زانستی دەروونییە لە زانکۆی (کارولینا) (لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا).
- بەپێی راپۆرتی دەزگای مەرکەزی ئەمەریکی بۆ پشکنین ولێکۆڵینەوە، ناسراو بە: (FPT)، هەموو (١٨) چرکەیەك لە ئەمەریکادا پیاوێك لێدانی ژنەکەی دەکات.
- رۆژنامەیەکی ئەمەریکی نووسیوێتی: لە هەموو دە ئافرەتێکی ئەمەریکی یەکێکیان مێردەکەی لێی دەدات، پاشان رۆژنامەی ( Family Relation) (واتە: پەیوەندی خێزانی) لەسەر ئەم هەواڵە قسەیەکی هەیە کە دەڵێت: لە هەموو دوو ئافرەتێك یەکێکیان لێدان دەکرێت لە لایەن مێردەکەیەوە، وڕووبەڕووی ستەم ودەستدرێژی دەبێتەوە.[1]
- لە فەرەنسا ساڵانە دوو ملیۆن ئافرەت ڕووبەڕووی لێدان دەبنەوە... متمانەداری نهێنییەکانی ولات بۆ مافەکانی ئافرەت (میشیل أندریە) وتوویەتی: هەندێك جار ئاژەڵەکان مامەڵەی باشتریان لەگەڵدا دەکرێت، وەك لە ئافرەتان. خۆ ئەگەر پیاوێك لەسەر شەقامێك بدات لە سەگێك، ئەوا کەسێك شکاتی لێ دەکات لای کۆمەڵەی بەنەرمی جووڵانەوە لەگەڵ ئاژەڵ، بەلام ئەگەر لەسەر شەقامێك لە ژنەکەی خۆی بدات، ئەوا یەك کەس جووڵە ناکات. (واتە کەس خۆی لە مەسەلەکە ناگەیەنێت).

---

(١) ئەوەی زیاتری دەوێت، با بگەڕێتەوە لای راپۆرتی لیژنەیەکی کۆنگرێسی ئەمەریکی بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر تاوانەکانی گەنج ومێرد منداڵەکان لە ئەمەریکا، لە ژێر ناونیشانی: (ڕەوشتی داهەرۆزاوی کۆمەڵگای ئەمەریکی). ئەم زانیاریەش لە کتێبی: (المجتمع العاري بالوثائق والأرقام/ ص١١)ەوە وەرگیراوە.

- (٩٢٪)ی کاری لێدان لە شارەکاندا ڕوو دەدات، (٦٠٪)ی ئەو شکاتانەی کە بەشەودا دەگاتە پۆلیسی فریاکەوتنی پاریس، بریتین لە: هاناهێنانی ئافرەتان لە دەست خراپی مامەڵەی مێردەکانیان.
- لە بەریتانیا ڕاپۆرتێك هاتووە لەسەر ئەوەی کە (٧٧٪)ی مێردەکان هەر بەبێ هۆ لێدانی ژنەکانیان دەکەن.
- هەروا لە بەریتانیا زیاد لە (٥٠٪)ی ئافرەتە کوژراوەکان بریتی بوون لە قوربانی دەستی مێرد یان دۆستەکانیان. توندوتیژی خێزانی زیادی کردووە بە ڕێژەی (٤٦٪) لە ساڵێکدا هەتاوەکو کۆتایی مانگی ئازاری ساڵی (١٩٩٢). هەروەها دەرکەوتوە کە (٢٥٪)ی ئافرەتان ڕوو بەڕووی لێدان دەبنەوە لە لایەن مێردەکانیان یان دۆستەکانیانەوە. پۆلیسی بەریتانی ساڵانە (١٠٠,٠٠٠) سەد هەزار پەیوەندی تەلەفوونی پێ دەگات، کە ئاگادار دەکرێتەوە لەسەر دەستدرێژی کردنە سەر ژنان (زوجات أو شريكات). هەر ئەو ڕاپۆرتە ئەوەشی تێدایە کە ژنێك باسی ئەوەی کردووە کە لەسەرەتای شوو کرد نییەوە، مێردەکەی سێ ساڵ ونیو لێی داوە، وتیشی: ئەگەر دوای لێدانەکە قسەم بکردایە، دووبارە لێی دەدامەوە، بۆیە هەروا بێ دەنگ بووم، خۆ ئەو تەنها بە یەك جۆر لێدان واز ناهێنێت، بەڵکو هەموو جۆرەکانی بەکار دەهێنێت، وەکو: بەدەموچاودا کێشان، مشتەکۆڵە، شەق، لەقە وخستنە ژێر پێ، کێشانی سەر بە دیواردا. هەندێك جار پیاوانێك هەبوون کە جگەرەیان بە لاشەی ژنەکانیان کوژاندۆتەوە، یان بە زنجیر وکۆت لە ماڵدا کۆتیان کردوون، پاشان دەرگایان لەسەر داخستوون، وچەند کاتژمێرێکی زۆر بەم جۆرە بەجێیان هێشتوون.

بەڕاستی لێدان ئابەم جۆرە، گومانی تێدا نییە کە بەڵایەکە وپێویستە هەموو مرۆڤەکان لە دژی ڕاوەستن، زانایانی موسوڵمانانیش دژی ئەم جۆرە لێدانەن، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە پەیوەندی نێوان پیاو وئافرەت لەسەر خۆشەویستی وسۆز ڕاوەستاوە، کە

ئەمەش لەگەڵ لێدان وئازاردان‌دا ناگونجێت، هەر بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆر بە توندی ئەم دیاریدەیە بە خراپ دادەنێت ورەدی دەکاتەوە، وەك دەفەرموێت: باشە ئەوە چۆن یەکێك لە ئێوە (شەرم ناکات) وەك چۆن لێدانی کۆیلەیەك دەکات، هەروا لێدانی ژنەکەشی دەکات، لە سەرەتای ڕۆژەوە وپاشان لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا دەچێت لەگەڵیدا جووت دەبێت؟! [1] کە ئەمەش بەرپەرچ دانەوەیەکە بۆ ئەو کەسانەی کە بە بێ بنەما دەڵێن: ئیسلام ئافرەتی بەکەم داناوە کە ڕێگەی داوە بە پیاو لێی بدات.

(١) ئەم فەرموودەیە لە هەریەك لەم سەرچاوانەدا هاتووە، بەڵام بە چەند دەقێکی جیاواز: البخاري/ كتاب النكاح/ باب ما يكره من ضرب النساء/ ٤٩٠٨، وابن حبان/ كتاب النكاح/ باب معاشر الزوجين/ ٤١٩٠، وعبد الرزاق في مصنفه/ كتاب العقول/ باب ضرب النساء والخدم/ ١٧٩٤٣، والبيهقي في السنن الكبرى/ كتاب القسم والنشوز/ باب الاختيار في ترك الضرب/ ١٤٥٥٧، والنسائي في السنن الكبرى/ كتاب عشرة النساء/ ضرب الرجل زوجته/ ٩١٦٦.

# دەروازەی سێیەم

# ئافرەتی موسوڵمان
# لە واقیعی مێژووییدا

دەسپێکێك وپێنج بەش لە خۆ دەگرێت:

بەشی یەکەم : ئافرەتگەلێکی حوکمڕان (حاکم).

بەشی دووەم : ئافرەتگەلێکی دادوەر (قاضي).

بەشی سێیەم : ئافرەتگەلێکی جەنگاوەر.

بەشی چوارەم : ئافرەتگەلێکی موفتی وزانا.

بەشی پێنجەم: ئافرەتگەلێك کە دەسەلاَتی جێبەجی کردنیان (السلطة التنفيذية) گرتۆتە دەست.

## دەسپێك

گومان لەوەدا نییە کە مێژوو ئاوێنەی شارستانی گەلانە، چونکە ئەگەر جێبەجێ کردنێکی کرداری وڕاستەقینە نەبوایە، ئەوا نەدەزانرا کە بیروڕاو بۆچوونی نەتەوەکان چۆن بووە، لەبەر ئەوە کە بیرو بڕوا جێگەکەی لە ناو مێشك ودڵی کەسەکاندایە، ئەوجا هەم کەسەکان وهەم کات وشوێن وبارودۆخەکانیش بریتین لە ڕەگەزەکانی ئەو ژینگەیەی کە ئەو بیرو بڕوایانەیان تێدا پەیڕەو دەکرێت. بەڵکو زیادەڕەوی ناکەین ئەگەر بڵێین: جێبەجێ کردن وپەیڕەوکردن تەنها ڕافەی ڕاستەقینەی ئەو بیردۆزانەیە کە لە ووشە و دەستەواژەکانیەوە زیاد لە مانایەك وەردەگیرێت.

جا هەر لەسەر ئەم مانایەش زانایانی ئوصولی فیقهی ئیسلامی لە هەندێك ڕووداودا، کردەوەی پێغەمبەریان(صلی الله علیه وسلم) پێش خستوە بەسەر وتەکانیدا. بەڵکو لە هەندێك کاتدا کردەوەی هاوەڵانی پێغەمبەریان(صلی الله علیه وسلم) کردووە بە ڕوونکەرەوەی دەقێکی شەرعی.

ئێمەش دوای ئەوەی کە پلەو پایە وپێگەی ئافرەتمان خستەڕوو لە قورئانی پیرۆز وفەرموودەکانی پێغەمبەردا(صلی الله علیه وسلم)، باسی کتێب وبەرهەمە فیقهیەکانمان کرد، کە چۆن باس لە ئافرەت دەکەن لە زۆرێك لەو مەسەلانەی کە ڕۆژئاوا بە خراپی باسی کردوون، هەوڵی داوە _ بە مەبەست یان بێ مەبەست _ کە ئەو مەسەلانە وەك خاڵی لاوازی ئەم ڕۆشنبیریە ئیسلامیە بەکار بهێنێت. ئەوجا دێینە سەر خستنەڕووی بارودۆخ وحاڵ وگوزەرانی ئافرەت لەو واقیع ومێژوەی کە تێیدا ژیاوە، کە دەبن بە پاڵپشتێك بۆ ئەو قسانەی کە لە باسەکانی پێشوودا کردمان لە بارەی بەرێزی وپارێزراوی ئافرەتەوە، کە هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ پیاودا نییە، لەو ڕوەوە کە جۆری مرۆڤ لە هەردووکیان پێکدێت.

واقیعی مێژوویی ئەو هەواڵەمان دەداتێ کە: ئافرەتانێکی زۆر هەبوون کە کاریگەریان هەبووە لەسەر ڕەوتی میللەتی ئیسلامی، لە هەموو بوارەکاندا بەشداریان کردووە لە بەرزکردنەوەی ڕێز وحورمەتی ئەم میللەتەدا.

لە ڕاستیدا ڕۆڵی ئافرەتی موسوڵمان هەر زۆر لە زووەوە دەستی پێ کردبوو، چونکە هەر ئافرەت بوو کە یەکەم کەس بوو ئیمانی بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هێنا، هەر ئافرەت بوو کە بووە یەکەم شەهید لە ڕێگەی خوادا، هەر ئافرەت بوو کە یەکەم کەس بووە کە بۆ خوا هیجرەتی کردبێت لەگەڵ مێردەکەیدا، پاش (**لوط**) (سەلامی خوای لێ بێت)، دایکە عائیشەیش خۆشەویست ترین کەس بووە بەلای پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم).

بەڵێ، دایکە خەدیجە یەکەم کەس بووە کە بڕوای بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هێناوە، وتەصدیقی کردووە، سەرەڕای ئەوەش پەناگا وپاڵپشتێکی باشیش بووە بۆی، بەڵکو زۆر یارمەتی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) داوە بە ماڵ و موڵکی خۆی، خوای گەورە لەئەو منداڵی بەخشی بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ئەو ساڵەی مردنی ئەوی ناونا بە: ساڵی دڵتەنگی.

خانمی گەورە وبەڕێز (سومەییەی کچی خەیاط) کە هاوسەری یاسری باوکی عەمار بوو، یەکەم شەهیدی ئیسلام بووە، گەلێك لە کوڕە گەنجەکەی خۆی بەهێز تر بوو، ئەوەبوو کە قبووڵی نەکرد جنێو بدات بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ووشەی کوفر بەسەر زمانیدا بێت، تاوەکو ڕزگاری ببێت، بەڵکو دەری خست کە چەندە خۆگرە وبڕوای بە ئاین وپێغەمبەر هێناوە، هەتاوەکو شەهید کرا.

خانمی گەورە وبەرێز (روقیەی کچی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) یەکەم کەسێك بووە کە لە ڕێگەی خوادا کۆچی کردبێت، لەگەڵ مێردەکەی کە ئیمامی عوسمانی کوڕی عەففان بوو.[١]

هەردوو خانمی گەورە (فاتیمەی کچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ودایکە عائیشە لە خۆشەویست ترینی کەسەکان بوون بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم). ئەومتە جارێك لێیان پرسی: کێ خۆشەویست ترین کەسە بەلاتەوە؟ ئەویش فەرمووی: فاتیمە. هەروەها بۆ دایکە عائیشەیش، ئەنەس(ی کوڕی مالیك) بۆمان دەگێڕێتەوە کە: پرسیار کرا لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم): کێ خۆشەویست ترین کەسە بەلاتەوە؟ ئەویش فەرمووی: عائیشە. وتی: لە پیاوان؟ فەرمووی: باوکی (واتە ئیمامی ئەبو بەکری صددیق)[٢]

ئەوجا پێگەی ئافرەت لە ئیسلامدا تەنها ئەوە نەبووە کە یەکەم ئیماندار، یەکەم شەهید، یەکەم کۆچکەر بێت، وخۆشەویست ترین کەس بێت بەلای پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)، بەڵکو بە تێپەڕینی چەرخەکان لەم حاڵەتانەش تێپەڕیوە، کە فەرمان ڕەوایەتی کردووە، وبووە بە دادوەر، و جیهادی کردووە، وبووە بە زانا، وفەتوای داوە، وکاروباری دەسەڵاتی جێبەجێ کردنی گرتۆتە دەست.. وزۆر کاری تریش کە مێژووی موسوڵمانان گەواهی بۆ دەدات، بۆیە ئێمەش هەر لەسەر ئەو ئەساسە ئەم دەروازەمان دابەش کرد بۆ چەند بەشێك:

بەشی یەکەم : ئافرەتکەلێکی حوکمڕان (حاکم).

---

(١) الحاكم في المستدرك/ كتاب معرفة الصحابة/ ذكر رقية بنت رسول الله/ ٦٨٤٩، والطبراني في المعجم الكبير/ العشرة المبشرين بالجنة/ نسبة عثمان بن عفان/ ١٤٣، والشيباني في الآحاد والمثاني/ ومن ذكر ذي النورين عثمان بن عفان ١/ برقم ١٢٢. ومن ذكر رقية بنت رسول الله/ ٥/ برقم ٢٩٧٨.

(٢) پێشتر باسمان لە تەخریجاتی ئەم دوو فەرموودەیە کرد، وسەرنج وتێبینیشمان لەسەریان هەبوو.

بەشی دووەم : ئافرەتگەلێکی دادوەر (قاضي).

بەشی سێیەم : ئافرەتگەلێکی جەنگاوەر.

بەشی چوارەم : ئافرەتگەلێکی موفتی وزانا.

بەشی پێنجەم: ئافرەتگەلێك کە دەسەلاتی جێبەجی کردنیان گرتۆتە دەست (السلطة التنفيذية).

# بەشی یەکەم

## ئافرەتگەلێکی فەرمانڕەوا ( حاکم )

مەبەست بە فەرمانڕەوایی ئافرەتان بۆ وڵات ئەوە نییە کە کاریگەریان هەبێت وکاروبارەکان ڕاپەڕێنن لە ڕێگەی مێردەکانیان یان کوڕەکانیان یان گەورەکانیانەوە، کە ئەوان فەرمانڕەوان، چونکە ئەم شێوازەلە ژماردن نایەت، بەتایبەتی لە سەردەمی دەوڵەتی عەباسیەکاندا بەشێوەیەکی زۆر هەبوون، سەرەتا وەك (خەیزەرانی کچی عەتا)[١] کە ژنی مەهدی عەباسی بووە، ودایکی هەردوو کوڕەکەی (هادي ومهدي) بووە، کە لە ساڵی (١٧٣)ی کۆچی وەفاتی کردووە. پاش ئەویش ژنێك بە ناوی (قبيحة) کە دایکی (معتز بالله) بووە[٢]، و لە ساڵی (٢٦٤)ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە. دواتریش ئافرەتێك بە ناوی (فاتیمە قارەمان)[٣] کە لە ساڵی (٢٩٩)ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە، دایکی موسای هاشمی قارەمانی ماڵی (المقتدر بالله)[٤]، دایکی (المقتدر بالله) کە ناوی (شەغەب) بووە[٥]، ولە ساڵی (٣٢١)ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە... زۆرێکی تریش کە لە ژماردن نایەن.

بەڵکو مەبەستمان ئەوانەیە کە خۆیان ڕاستەوخۆ وبە ڕوونی فەرمانڕەوایی وڵات وهەرێمە ئیسلامییەکانیان کردووە.

---

(١) تأريخ الطبري/ ٤/ ٦٢٢، و/ ٨/ ٢٣٤، وتأريخ بغداد/ ١٤/ ٤٣٠.

(٢) تأريخ الطبري/ ٥/ ٥١٤، وأعلام النساء/ ٤/ ١٨٤.

(٣) البداية والنهاية/ ١١/ ١١٨، وأعلام النساء/ ٤/ ٩١.

(٤) أعلام النساء/ ٥/ ١٢٢.

(٥) البداية والنهاية/ ١١/ ١٧٥، وأعلام النساء/ ٥/ ٦٧.

بەڕاستی هەندێك ئافرەت فەرمانڕەوایی هەندێك لە وڵات وهەرێمە ئیسلامیەكانیان كردووە لە ماوە وسەردەمە جیاوازەكاندا، ئەگەرچی هیچ ئافرەتێك لە ئیسلامدا نازناوی جێگەنشین (الخليفة)ی پێ نەدراوە، بەلاَم لەو نازناوە خوارتر زۆر نازناوی تری پێدراوە، وەك: (سلطان، ملك، الحرّة، خاتون).

وە لە مێژووی ئیسلامیدا هاتووە كە زیاد لە پەنجا ئافرەت هەبوون كە فەرمانڕەوایی هەرێم وولاَتە ئیسلامیەكانیان كردووە بە درێژایی مێژوو:

- (ست الملك) كە یەكێك بووە لە فەرمانڕەوای فاتیمیەكان لە میصر، كە لە سەرەتای سەدەی پێنجەمی كۆچی حوكمڕانی كردووە.
- دوو شاژن، بە ناوی (أسماء، وأروى) كە فەرمانڕەوایی (صنعاء) یان كردووە لە كۆتایی سەدەی پێنجەمی كۆچی دا.
- (زینب النفزاویة) لە وڵاتی ئەندەلوس (ئەسپانیای ئێستا).
- (سلطانة رضیة) كە فەرمانڕەوایی شاری (دلهي) كردووە لە نیوەی سەدەی حەوتەمی كۆچی دا.
- (شجرة الدرّ) كە ئەویش فەرمانڕەوایی وڵاتی میصری كردووە لە سەدەی حەوتەمی كۆچی دا.
- (عائشة الحرّة) لە وڵاتی ئەندەلوس.
- (ست العرب)، و(ست العجم)[1]، و(ست الوزراء)[2]، و(الشریفة الفاطمیة)،

(١) ناوی (فاطمة بنت محمد بن محمد بن جبریل) مەشهورە بە (ست العجم)، لە (١٩)ی ڕەمەزانی ساڵی (٧٣٧)ی كۆچی، لە قاهیرە وەفاتی كردووە، ولە (قرافة) ئەسپەردەی خاك كراوە. بڕوانە: (الدرر الكامنة في أعيان المئة الثامنة/ ١/ ٤٢٠). (وەرگێڕ)

(٢) دوو ئافرەت هەن بەم نازناوە بەناوبانگن، یەكێكیان بە ناوی (ست الوزراء بنت عمر بن أسعد بن المنجا التنوخية الدمشقية الحنبلية) لە ساڵی (٦٢٤)ی كۆچی لە دایك بووە، وە لە (١٨)ی شەعبانی ساڵی (٧١٦) كۆچی دوایی كردووە. وە ئەوی تریان بە ناوی (ست الوزراء بنت تاج الدين أبي الفضل يحيى بن مجد الدين أبي المعالي محمد بن أحمد في مسنده بن حمزة بن علي هبة الله الحبوبي الثعلبي) لە ساڵی (٦٨٩)ی كۆچی لە دایك بووە، وە لە (٤)ی شەوالی ساڵی (٧١٥) كۆچی دوایی كردووە. بڕوانە (الدرر الكامنة/ ١/ ٢٢٧). (وەرگێڕ)

و(الغالية الوهابية)، و(الخاتون ختلغ تاركان)، (الخاتون بادشاه)، و(غزالة الشبيبة)[1]، زۆرێکی تریش.
جا بۆ ئەوەی کە درێژەی پێ نەدەین، چەند نموونەیەکی ئافرەتان هەڵدەبژێرین کە فەرمانڕەوایی وڵاتیان کردووە، وبە شێوەیەکی درێژ باسیان دەکەین، کە بە (ست الملك) دەست پێ دەکەین:

## ١- (ست الملك) پاشای فاتیمیەکان

یەکێکە لە پاشا فاتیمیەکانی وڵاتی میصر، دەسەڵاتی گرتەدەست دوای ئەوەی کە پرۆسەی شاردنەوەی براکەی ڕێکخست بە ناوی (الحاكم بأمر الله) کە خەلیفەی شەشەمی فاتیمیەکان بووە لە ساڵی (٤١١)ی کۆچی دا، کە دەگێڕنەوە خۆی کوشتوویەتی.
ئیمامی زەهەبی دەفەرموێت: ((پەیمانی بەستووە لەگەڵ ئەمیر (ابن دواس)، وپاشان بە نهێنی چوە بۆلای، وئەویش جێگەی کردۆتەوە، ئەوجا بەو ئەمیرەی گوت: بۆ ئەوە هاتووم کە خۆم وتۆیش بپارێزم، ئەویش پێی گوت: من لە خزمەتتدام، ئەوجا پێی گوت: تۆش وئێمەش لە مەترسیداین، ئەو کەسە ڕێزی باوك وباپیرانمانی کز کردووە، وتەواو شێت بووە، وکارێك دەکات کە هیچ موسوڵمانێك ئارامی لەسەر ناگرێت، ومنیش دەترسم کە بکوژرێت، وئێمەشی

---

(١) هاوسەری پیاوێك بووە بە ناوی (شبيب بن يزيد بن نعيم الشيباني الحروري)، ئافرەتێکی زۆر بەناوبانگ بووە لە ئازایەتی وسوارچاکیدا، لە شاری موصل لەدایك بووە، لە سەردەمی (عبد الملك)ی کوڕی مەرواندا لەگەڵ مێردەکەیدا لە دژی عبد الملك شەڕیان کردووە، لە ڕۆژانی دەسەڵاتدارێتی حەجاجی کوڕی یوسف، وهەر وەکو پاڵەوان شەڕی دەکرد، کە دەگێڕنەوە حەجاج لە یەکێك لە شەڕەکاندا لەبەری هەڵهاتووە، ودواتر هەندێك لە شاعیرەکان بە عەیب وعاریان باس کردووە بۆی. بڕوانە: (الأعلام للزركلي/ ٥/ ١١٨، ووفيات الأعيان لابن خلكان/ ٢/ ٤٥٤، تأريخ الإسلام للذهبي/ حرف الشين/ شبيب بن يزيد ابن نعيم بن قيس بن عمرو بن الصلت الشيباني الخارجي). (وەرگێڕ)

لەگەڵدا بکوژرێین، وئیتر ئەم وڵاتە بە خراپترین وناشیرین ترین شێوە لەناو بچێت، ئەویش وتی: ڕاست دەکەیت، ئەی چی بکەین؟ ئەویش وتی: سوێندم بۆ بخۆ ومنیش سوێندت بۆ دەخۆم کە ئەمە بشارینەوە، وئیتر ڕێك کەوتن لەسەر ئەوەی کە بیکوژن)).[1]

ئەم ئافرەتە چەند شتێك هەبوو کە پاڵی پێوە بنێن بۆ ئەم کارە، چونکە تێپەڕاندنەکانی براکەی زیاد لە حەد بوو، چونکە دەسەڵاتی خۆی زۆر بە خراپی بەسەر خەڵکە هەزارەکاندا بەکار دەهێنا، گلاری لە سەگ بڕیبوو بە مەبەستی لەناو بردنیان، نەیدەهێشت ئافرەتان لە ماڵ بچنە دەرەوە، شاری قاهیرەی سووتاند، ونەیدەهێشت دانیشتوانەکەی بە ڕۆژدا کار بکەن، وفەرمانی پێ دەکرد کە بە شەو کار بکەن، لە پێناوی ئەوەی کە بە شەودا بە قافڵەی دارودەستەکەیەوە دەربچێت وببینێت کە جموجوڵێکی زۆری تێدایە، ڕۆژێك ئەوەندە خۆی بەرز کردەوە بەڕادەیەك کە ئیعلانی خوایەتی خۆی کرد (پەنا بەخوا)، وداواشی کرد کە هەموو خەڵکی قاهیرە (بە خوشکەکەشیەوە) دەبێت بەندایەتی بۆ ئەم بکەن وبیپەرستن.

## ٢- ( أروى ) پاشای ( صنعاء )

ناوی ئەروای کچی ئەحمەدی کوڕی جەعفەری صولەیحیە، شاژنێکی بەهێز بووە، وکاربەدەستێکی وڵاتی یەمەن بووە، لەو وڵاتە لە جێگەیەك بە ناوی (حراز)ەوە لە ساڵی (٤٤٠)ی کۆچی لەدایك بووە. لە بەردەستی ئەسمائی کچی شەهابی صولەیحیدا گەورە بووە وپەروەردە کراوە، و دواتریش شووی کردووە بە کوڕەکەی.

---

(١) . أعلام النبلاء للذهبي/ ١٥/ ١٨١.

ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لە بڵاو بوونەوەی مەزهەبی فاتیمیەکان لە ئاسیاداو بە شێوەیەکی تایبەت لە شاری بۆمبای لە هیندستان، لە ڕێگەی بانگەشە خوازانی فاتیمیەکانەوە کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەمدا بەرەو ئەوێ دەرچووبوون.

ئەوەبوو لە پاش مردنی ئەسمانی شازن لە ساڵی (٤٨٠)ی کۆچی (١٠٨٧ ی زاینی)، کوڕەکەی بە ناوی (مەشلول) بە فەرمی کاروبار وبەڕێوە بردنی وڵاتی بە ژنەکەی خۆی سپارد، کە ناوی ئەروا بوو، ئەمیش توانی بەردەوامێتی دەسەڵاتی فاتیمیەکان مسۆگەر بکات بە دەستی صولەیحیەکانەوە لە یەمەن، ئەوجا پاش ئەوەی کە ئاسایش وئارامی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشا، ئەم بڕیاری دا تۆڵە بسێنێتەوە لە کەسێك بە ناوی (سەعیدی زوبەیدی)، کە مامەی (ئەرواى) کوشتبوو، ئەوەبوو پایتەختی گواستەوە بۆ (جبالة) کە جێگەیەکی پشت ئەستوور بوو بە کەژ وکێو، ودەستی کرد بە تەنگ پێهەڵچنینی (سەعیدی زوبەیدی)، ئەوجا پاش ئەوەی کە پەیمانی بەست لەگەڵ وڵاتانی تردا، توانی سوپاکەی سەعید تێکبشکێنێت وسەعیدیش بکوژێت، وژنەکەشی بە دیل بگرێت.

ئەوجا دەستی کردەوە بە ڕێکخستنەوەی شانشی نییەکەی وسەرپەرشتی کردنی جەنگەکان، تا ئەو کاتەی کە مێردەکەی مرد، لە ساڵی (٤٨٤ك)، وکوڕە مامەکەی بە ناوی (سەبەئی کوڕی ئەحمەد) جێگەی گرتەوە، ئیتر ئەم هەر لە دەسەڵات وفەرمانڕەواییدا بەردەوام بوو، هەموو نوسراوێك بۆ ئەو بەرز دەکرایەوە، ووەزیرەکانیش لەدەوری کۆ دەبوونەوە، وئەمیش لە پشتی پەردەوە حوکمی دەکردن، ولەسەر مینبەرەکانی یەمەن دوعای خەیریان بۆ دەکرد، ئەوجا لە ساڵی (٤٩٢ك) پاشا سەبەئیش کۆچی دوایی کرد، بەمەش دەسەڵاتداریێتی صولەیحیەکان لاواز بوو، بۆیە ئەمیش پەنای بردە بەر ناوچەی (جبلة) ولەوێ دەستی گرت بەسەر کاروباری قەڵاکانی دەوروبەریدا، ووەزیر

وکاربەدەستی بۆ دانان، وهەروا هەتاوەکو چل ساڵێك بەردەوام بوو، هەتاوەکو لە ساڵی (٥٣٢ك) لە (ذي جبلة) کۆچی دوایی کرد، ولە مزگەوتی ئەو شارەدا سپاردەی خاك کرا، وکە زۆرێك لە کاری باش ومەوقوفاتی بەجێ هێشتوە، وهەر ئەمیش دوایین پاشا وفەرمانڕەوای صولەیحیەکان بووە.(١)

## ٣- ترکان خاتون

ناوی ترکان خاتوونی کچی خاجنکشە، ژنی سوڵتان (تکش کوڕی ئایل رسلان) بووە، ئافرەتێکی پایەدار وخاوەن بیر وبۆچوون بووە، وساڵی (٦٢٨)ی کۆچی فەرمانڕەوایی ولاتی گرتۆتە دەست. هەرکاتێك کێشە وستەمێکیان بهێنایەتە بەردەستی، ئەویش بە چاکە ودادوەریانە فەرمانی بۆ دەردەکرد، ومافی ستەم لێکراوەکەی لە ستەمکارەکە وەردەگرتەوە، وبێ باك بوو لەوەش کە لە بریتی کەسە ستەم لێکراوەکەدا کەسە ستەمکارەکە بکوژێتەوە. زۆرێك جێکەی چاکەکاری وخەیر ووەقف کراوی لە سەرانسەری ولاتدا هەبوو، حەوت کەس لە زانایان وپایەداران وگەورە پیاوانی لەبەردەستدا بوو کە شتیان بۆ دەنووسیەوە. هەر کاتێك کە لە ئەو وسوڵتانەوە دوو واژوو لەسەر یەك مەسەلە بوایە، سەرنجی مێژوەکەیان دەدرا وکار بە دوایین واژوو دەکرا لە هەموو هەرێمەکاندا (واتە: واژووی ترکان وواژووی سوڵتان هاوشان بوون)، واژووی خۆشی بریتی بوو لە: (عصمة الدنيا والدين ألغ تركان ملكة نساء العالمين)، نیشانەکەشی بریتی بوو لە: (اعتصمت بالله وحده)، بە پێنووسێکی تۆخ زۆر بە باشی دەینووسیەوە، بە جۆرێك کە لێبوونەوەی نیشانەکە گران وسەخت بوو کە ساختەی تێدا بکرێت.(٢)

---

(١) الأعلام للزركلي/ ١/ ٢٨٩، وأعلام النساء/ ١/ ٢٥٣.
(٢) أعلام النساء/ ١/ ١٦٩.

## ٤- ( رضيية بنت التمش ) فەرمانڕەوای هیندستان:

ئەم ئافرەتە دەسەڵاتدارە دەگەڕێتەوە سەر یەكێك لە خێزانە توركیەكان لە مەمالیكەكانە. لە ساڵی (٦٣٤)ی كۆچی (١٢٣٦ ی زاینی) لە دوای مردنی باوكی (سوڵتان ئیلتوتمش خان) فەرمانڕەوایی هیندی گرتە دەست، كە باوكی یەكێك بوو لەو سەركردە سەربازیانەی كە پایەی دەوڵەتی ئیسلامیان لە هیند دامەزراند. باوكی ئەمی هەڵبژارد بەسەر دوو براكەی تریدا، چونكە زۆر بە تواناو وریا وژیر وبەهرەدار بووە لە بەڕێوەبردنی كاروباری وڵات، بەڵام براكانی وەك ئەم نەبوون.

یەكەم بڕیارێكی پاشایانە كە دەری كرد بریتی بوو لە بڕیاری لێدانی پارە بە ناوی خۆیەوە، ناونیشانێكیشی بۆ خۆی هەڵبژارد، كە بریتی بوو لە: (رضيية الدنيا والدين).

لە كاتێكدا كە كاربەدەستەكانی دەوروبەری وسەركردەكانی سوپا ویستیان لەسەر تەخت دووری بخەنەوە، كە هاوكات بوو لەگەڵ كوژرانی برا بچووكەكەی لە لایەن برا گەورەكەیەوە، هەموو ئەو هەوڵانە پووچەڵ بوونەوە، چونكە ئەم زیاتر پشتی بە گەل وخەڵكەكەی بەستبوو، كە ئەوان شۆڕشیان بەرپا كرد لە دژی براكەی، ئەمیش فەرمانیدا بە كوشتنی براكەی.

بەمەش بوو بە یەكێك لەو پاشا و فەرمانڕەوایانەی هیند كە دەسەڵات وپێگە وكارگێڕیەكی باشی هەبوو، بۆ ماوەی چل (٤٠) ساڵ فەرمانڕەوا بوو، دواتر لە: (٢٥)ی رەبیعی یەكەمی ساڵی (٦٣٧) كوژرا، وگۆڕەكەشی لە كەناری ڕووباری (جمن)ە لە نزیك (دلهي).[1]

---

(١) الإعلام بما في الهند من الأعلام/ ١/ ٩٩، أعلام النساء/ ١/ ٤٤٩.

## ٥- (شجرة الدرّ) شاژنی میصر وولاّتی شام

ئەمیش یەکێکە لە شاژنە بەناوبانگەکان لە مێژووی ئیسلامدا، کە بەڕێوە بردنێك وژیری ووریایی ولێهاتوویی وچاکەکاری وخزمەتگوزاریەکی باشی هەبوو، کە کەنیزەکی پاشا (صالح) بوو، کە لە سەردەمی باوکیدا بووبوو بە خاوەنی، منداڵێکی لێی بوو بە ناوی (خلیل) وپاشان بوو بە هاوسەر وخێزانی، ولەگەڵ خۆیدا دەیبرد بۆ ولاّتانی ڕۆژهەلاّت، ودواتریش هەر لەگەڵ خۆیدا گەڕاندیەوە بۆ ولاّتی میصر، بەمەش ناوبانگە دەرکرد لە دەوڵەتی صالیحیەکاندا، وزۆرینەی کاروباری بەڕێوە بردنی ولاّتی کەوتە دەست لە سەردەمی دەسەلاّتی مێردەکەیدا، ودواتریش لە سەردەمی نەخۆشی مێردەکەیدا، دەست وخەتی زۆر لە دەست وخەت ونووسینی پاشا دەچوو، فێری واژوو کردنی پاشاش بوو، ودواتریش خۆی ڕاستەوخۆ دەستی کرد بە فەرمانڕەوایی، بە جۆرێك کە مەرسوومەکانی ولاّتی لە برێتی سوڵتان واژوو دەکرد، هەتا ئەو کاتەی کە (تورانشاە) گەیشتە شاری (منصورة)، وهەواڵێکی هەڕەشە ئامێزی بۆ نارد کە داوای ماڵ وموڵکەکانی لێ دەکرد، بۆیە ئەویش هەوڵیدا کە ئەم (تورانشاە)ە بکوژێت، ئەوە بوو لە (٧)ی موحەڕەمی ساڵی (٦٤٨)ی کۆچی کوژرا. ئیتر دواتر ڕێك کەوتن لەسەر ئەوەی کە ئەم ئافرەتە فەرمانڕەوایی بگرێتە دەست، ئیتر کاربەدەستەکانی تریش پێی ڕازی بوون، بەمەش ئەم بوو بە نۆیەم کەس لە پێڕی ئەیووبیەکان کە فەرمانڕەوایی میصر بگرێتە دەست، کە ئەمەش لە (٢)ی صەفەری (٦٤٨)ی کۆچی بوو، کەسێکی تورکومانی صالیحیشیان بە ناوی (عز الدین أیبك) کردە سەرکردەی سەربازەکانی، خۆشی زۆر بە باشی دەستی کرد بە فەرمانڕەوایی کردنی ژێر دەستەکانی، خەڵکیش زۆر لێی ڕازی بوون، ئیتر ئەمیش مەرسوومی دەر دەکرد، کە واژووی خۆی بە دەست نووسی خۆی لەسەر بوو بە ناوی (دایکی

خەلیل)، هەروەها لەسەر مینبەرەکانی میصر وشام لە ڕۆژانی هەینیدا بە ناوی ئەوەوە وتار دەدرا، پارەیەکیشی دەرکرد وئەم نەخشاندنەی لەسەر هەڵکۆڵی: (**السكة المستعصمية الصالحية ملكة المسلمين والدة الملك المنصور خليل**)، ئیتر بەم کارگرتنە دەستە، ئەم ئافرەتە تەواوی کارەکانی ڕادەپەڕاند، وزۆر بە باشی فەرمانڕەوایی وڵاتی دەکرد، یەکەم کارێك کە پێی هەستا بریتی بوو لە نەهێشتنی صەلیبییەکان لە وڵاتدا، بۆیە دەستی کرد بە گفتوگۆ کردن لەگەڵیاندا، ودواتر ڕێکەوت لەگەڵ پاشا (لویسی نۆیەم) کە دیل کرابوو لە شاری مەنصورە، لەسەر ئەوەی کە شاری (**دمیاط**)یان تەسلیم بکات، لەبەرامبەر ئەوەی کە هەم خۆی وهەم دیلە گەورەکانیش بەر بدرێن لە بەرامبەر فیدیەیەکی گەورە وزۆرەوە کە بڕەکەی (٨٠٠,٠٠٠) هەشت سەد هەزار دۆنم بوو، کە نیوەی بەر لە ڕۆشتنی خۆی بدات، نیوەکەی تریشی دوای ئەوەی کە دەگاتە شاری (عەکا)، بەڵێنیشی دا کە جارێکی تر نەگەڕێتەوە بۆ سەر کەنارەکانی وڵاتی ئیسلام.

ئەم ئافرەتە ئافرەتێکی چاکەکار ودیندار بووە، سەرکردەیەکی گەورە بۆە لە دڵی خەڵدا، کە گەلێك چاکە وئیشی باش وئەوقافی بەجێ هێشتووە کە بۆ چاکەکاری خەرج بکرێن، هەر بە چاکەکاریش ناسراو بوو، بەڵام دواتر لە کۆتایی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی (٦٥٥)ی کۆچیدا کوژرا.[1]

## ٦- (السلطانة خديجة) فەرمانڕەوای هیندستان

ناوی خەدیجەی کچی عومەری کوڕی صەلاح الدینی بونجالیە، کە یەکێك بووە لە فەرمانڕەواکانی هیندستان، کە لە خزمەتی باوکیدا گەورە بوو پەروەردە کرا، ئەوەندە زانست وڕۆشنبیری پەیدا کرد کە وای لێ هات بوو بە

---

(١) النجوم الزاهرة/ ٦/ ٣٣٢، وأعلام النساء/ ٢/ ٢٨٦.

یەکێك لە ئافرەتە کەم وێنەکانی سەردەمی خۆی لە ڕووی ئەدەب وزانست وڕەوشت بەرزیەوە. جا کاتێك کە باوکی کۆچی دوایی کرد، براکەی کە ناوی (شهاب الدین) بوو، بوو بە جێگەداری، بەلام کەسێکی خراپەکار بوو، ومێژوویەکی خراپی هەبوو، بۆیە گەل هەستا بە لابردنی لەسەر دەسەلات، لە ساڵی (٧٤٠)ی کۆچی، پاشان بانگیان کردە خوشکەکەی کە ناوی (خديجة) بووە، تاوەکو فەرمانڕەوایی سەر تەختەکەی باوکی بگرێتە دەست، مێردەکەشی کە ناوی جەمالەدین بووە، و وتاربێژی ولاتیش بووە، کاری وەزارەتی گرتە دەست، وشاژنیش پشتی پێ دەبەست لە ڕاپەڕاندنی ئەرك وکاروبارەکانی ولاتدا، خۆشی چاودێری کاروباری ولاتی دەکرد، بە چاودێریەکی پسپۆڕانە، هەتاوەکو لە ساڵی (٧٧٠)ی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد.[1]

---

(١) رحلة ابن بطوطة لمحمد المغربي/ ٢/ ٦٦١، وأعلام النساء/ ١/ ٣٣٨.

# بەشی دووەم

## ئافرەتگەلێکی دادوەر ( قاضي )

لەگەڵ ئەوەشدا کە زانایانی فیقهی ئیسلامی ناکۆکن لە بڕیاری درووستی گرتنە دەستی کاری دادوەری لەلایەن ئافرەتانەوە، ئەوەتە زۆرینەیان وای بۆ دەچن کە بە هیچ جۆرێك ڕەوا نییە کە ئافرەت ئەم پۆستە وەربگرێت، بەلاّم زانایانی مەزهەبی حەنەفی پێیان وایە کە دروستە ئەو کارەی بدرێتێ، بەلاّم لەو جۆرە مەسئەلانەی کە درووستە ئافرەت شایەتیان تێدا بدات، هەندێکیش لە زانایان، وەکو: (ابن جرير الطبري)، و(ابن حزم الظاهري)، و(ابن طراز) لە شافیعیەکان، و(ابن القاسم)، وگێڕانەوەیەکیش لە ئیمامی مالیکەوە، پێیان وایە کە لە هەموو مەسئەلەیەکدا بە ڕەهایی درووستە کە ئافرەت کاری دادوەری پێ بسپێردرێت.

بەلاّم ئەوەندە هەیە کە سەرچاوە مێژووییەکان تەنها یەك حاڵەتیان بۆ ئێمە تۆمار کردووە کە ئافرەت تێیدا بووبێت بە دادوەر، کە ئەویش ئافرەتێکە بە ناوی: (ثمل قهرمانة شغب أم المقتدر).

### ( ثمل قهرمانة )

ئافرەتێکی بەڕێز وپایەدار وبەدەسەلاّتی دەوڵەتی عەباسیەکان بووە لە سەردەمی (المقتدر بالله)، کە دەستە ڕاستی دایکی (مقتدر) بووە، وسەرپەرشتی کاروبار وسیاسەتی دەوڵەتی دەکرد، ئەوجا متمانەی دایکی (مقتدر) بەم ئافرەتە گەیشتە ڕادەیەك کە فەرمانی پێ بکات کە لە ناوچەی (الرصافة)

دابنیشێت، وبروانێتە کێشە وناکۆکیەکانی خەڵك، ئەمەش لە ساڵی (٣٠٦)ی کۆچی، هەفتەی یەك ڕۆژ سەیری نووسراو وداوای خەڵکەکە بکات. خەڵکیش نارەزاییان دەربڕی، وزۆر تانەیان لێ گرت، ئەوەبوو یەکەم ڕۆژ دانیشت وهیچ کەسێك ڕووی تێ نەکرد، پاشان ڕۆژی دووەم دانیشتەوە وقازی ئەبو حەسەنی ئیبنولئەشنانی لەگەڵ خۆی هێنا، کە ئەویش زۆر بە جوانی باسی ئەم ئافرەتەی کرد، ویارمەتی دەدا وهاوکاری دەکرد، ئیتر نوسراو وبڕیارەکان دەردەچوون وواژوو ونووسینی ئەم ئافرەتە دادوەرەی لەسەر بوو، بەمەش کەسانی ستەم لێکراو سوودمەند دەبوون، تاوای لێهات کە دڵی خەڵکەکە هێور بوویەوە، ووازیان لەوە هێنا کە پێشتر پێی ڕازی نەبوون کە ئەم ئافرەتە کاری دادوەری بگرێتە دەست، ئەوەبوو کە خەڵکانێکی شەرع زان ودادوەر وناودار وپایەدار لە مەجلیسیدا دادەنیشتن، پاشان لە ساڵی (٣١٧)ی کۆچی دوایی کرد.[1]

ئیتر هەر بەم شێوەیە، بێجگە لەم حاڵەتە هیچ حاڵەتێکی تر تۆمار نەکراوە کە ئافرەت بووبێت بە دادوەر، ئەگەرچی حاڵەتەکانی گرتنە دەستی دەسەڵاتی باڵا وفەرمانداریێتی وپاشایەتی لە پۆستی دادوەری بەرز ترن.

جا هەندێك لەو شاژنانەی کە باسمان کردن تەماشای کێشەی نێوان خەڵکیان دەکرد وبڕیاریان تێدا دەدا، وەکو: ترکان خاتون، کە هەرکاتێك کێشەیەکیان بهێنایەتە بەردەستی زۆر بە چاکی ودادپەروەرانە بڕیاری تێدا دەکرد وحوکمی بۆ دەردەکرد، ومافی وەردەگرتەوە لە کەسی ستەمکار بۆ کەسی ستەم لێکراو، گوێشی نەدەدا بەوەی کە ئەگەر پێویستیشی بکردایە بڕیاری کوشتنی بۆ دەردەکرد.

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير/ ١١/ ١٢٩، والمنتظم لابن الجوزي/ ٦/ ١٤٨، وشذرات الذهب لابن العماد الحنبلي/ ١/ ٢٤٧.

# بەشی سێیەم

## ئافرەتگەلێکی جەنگاوەر وسەرکردەی سوپا

ئەو کاتەی کە ڕۆڵی پیاوان دەستی پێ کرد بۆ جیهاد کردن، ڕۆڵی ئافرەتانیش لە هەمان کاتدا بەدەر کەوت، بەڵکو ڕۆڵی ئافرەتان لە پێشتریش بووە لە ڕۆڵی پیاوان، چونکە یەکەم کەسێك کە شەهید بوو لە ڕێگەی خوادا ئافرەت بوو، کە بریتی بوو لە خاتوون (سمیة)ی هاوسەری (یاسر).

ئەسمائی کچی ئیمامی ئەبو بەکر یەکەم ئافرەتی خۆبەخش بوو کە خواردنی دابین کرد بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وهاوەڵەکەی (ئەبو بەکر). لە پێناوی شاردنەوە وناشکرا نەکردنی ئەم هەواڵ وباسە، ئازارێکی زۆری بینی لە دەست ئەبو جەهل.

ئاینی ئیسلامیش داوای کردووە لە ئافرەتان کە پارێزگاری لە وڵات وزەوی وگەلی خۆیان بکەن، هەروەك چۆن داوای لە پیاوان کردووە. پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ڕازی بووە بەوەی کە ئافرەتانیش بەشداری لە جەنگ وجیهاد وغەزاکاندا بکەن، بەڵکو چەندین ئافرەت هەر بە فیعلی لەخزمەت پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بەشداری جیهادیان کردووە، وەك: (أم سليم بن ملحان، وأم حرام بنت ملحان، وأم الحارث الأنصارية، والربيع بنت معوذ عفراء، وأم سنان الأسلمية، وأم سليط ليلى الغفارية، وكعيبة بنت سعيد الأسلمية، وحمنة بنت جحش، ورفيدة الأنصارية، وأم الزياد الأشجعية)

## ١- ( أم سليم بنت ملحان الأنصارية )

چەند وتەیەك هەیە لە ناوەكەیدا، دەوترێت كە ناوی (**الغميصاء**)[1] یان (**الرميصاء**) یان (**سهلة**) یان (**انيفة**) یان (**رميثة**)ی كچی **ملحان بن خالد بن زيد بن حزان بن جندب بن عامر بن غنم بن عدي بن نجار الأنصارية الخزرجية**) بووە، كە دایكی خزمەتكارەكەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (**ئەنەسی كوڕی مالیك**) بووە.

مێردەكەی كە ناوی (**مالك بن النضر**) بوو، مرد، پاشان كەسێك مارەی كرد بە ناوی (**أبو طلحة زيد بن سهل الأنصاري**)،و لەم پیاوە دوو كوڕی بوو بەناوی (**أبو عمير، عبد الله**). ئەم ئافرەتە بەشداری غەزای ئوحودی كرد، زۆر بە باشی بە كاری خۆی هەستا. هەروەها لە غەزای حونەینیشدا لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ئامادە بووە، خەنجەرێكی پێ بوو، ئەوەبوو ئەبو تەلحە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە ئومو سولەیمە، وخەنجەرێكی پێیە!. ئوم سولەیمیش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا هەڵم گرتوە بۆ ئەوەی ئەگەر یەكێك لە موشریكەكان لێم نزیك بوویەوە، ورگی پێ بدڕم، ئیتر پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) زەردەخەنەیەكی كرد.[2]

---

(١) سير أعلام النبلاء/٢/ ٣٠٤.

(٢) الاستيعاب/ ٤/ ١٩٤٠، وطبقات ابن سعد/ ٨/ ٤٢٥، وأعلام النساء/ ٢/ ٢٥٦.

هەروەها ئەم باسە لەم سەرچاوانەشدا هاتووە: (صحيح مسلم، وسنن أبي داود، ومسند الإمام أحمد في مسنده، وصحيح ابن حبان، والمعجم الكبير للطبراني، ومسند أبي يعلى، ومصنف ابن أبي شيبة في مصنفه، وسنن البيهقي الكبرى). بەتایبەتی ئەم دەقە لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە لە/ كتاب الجهاد والسير/ باب غزوة النساء مع الرجال/ ١٨٠٩.

## ٢- ( أم حرام بنت ملحان )

ناوی (أم حرامی کچی ملحانی کوڕی خالدی کوڕی حرامی کوڕی جندبی کوڕی عامری کوڕی غنمی کوڕی عدی کوڕی نجاری ئەنصاری نەجاری مەدەنییە) خوشکی ئوم سولەیمە، وپوری ئەنەسی کوڕی مالیکە، هاوسەر وژنی عوبادەی کوڕی صامیتە، چیرۆکی لە تەواوی دیوانەکاندا هاتووە بێجگە لە جامیعی ئەبو عیسی، یەکێك بووە لە ئافرەتە پایەبەرزەکان، کە ئەنەسی کوڕی مالیك وکەسانێکی تریش ئەم فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە:

ڕۆژێـك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ماڵی خۆی پاش نیوەڕۆیەك خەوتبوو، پاشان کە بەخەبەر هات، پێکەنی، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، بەچی پێ دەکەنیت؟ فەرمووی: ((کەسانێکی ئوممەتەکەمم پیشان درا کە سواری ئەم دەریایە دەبوون، وەکو پاشاکان کە چۆن سواری قەرەوێڵە دەبن ولەسەری دادەنیشن)). منیش وتم: داوا بکە لە خوا کە منیش یەکێك بم لەوانە. ئەویش فەرمووی: (تۆ لە پێشینەی ئەوانی). ئەوەبوو عوبادەی کوڕی صامت مارەی کرد، ولە غەزایەکدا بەناو دەریادا ڕۆشتن، وئەویشی لەگەڵ خۆیدا برد، جا کاتێك کە گەڕانەوە، ولاغێکی بۆ هێنا کە سواری ببێت، ولاغەکەش فڕەی دا خستیە خوارەوە وملی شکاند، وکۆچی دوایی کرد.[1] منیش دەڵێم: دەڵێن ئەو غەزایە غەزای دورگەی (قبرص یان قبرس) بووە لە سەردەمی خەلافەتی ئیمامی عوسمان وفەرمانڕەوایی موعاویەدا[2]، کە بەو مردنەی، پلەی شەهیدی دەست کەوت، ولە غەزاشدا بەشداری کرد.

---

(١) ئەم باسە لەم سەرچاوانەشدا هاتووە: (سنن ابن ماجه، ومسند الإمام أحمد في مسنده، وسنن الدارمي، وصحيح ابن حبان، والمعجم الكبير للطبراني، وسنن البيهقي الكبرى)

(٢) سير أعلام النبلاء/ ٢/ ٣١٦ _ ٣١٧.

## ٣- ( الربيع بنت معوّذ )

ناوی ڕەبیعی کچە موعەوەزی کوڕی عەفرائی ئەنصاریە، ولە هۆزی بەنی نەجارە.. لەبەر خزمایەتی، ئەو بەیا نییەی کە شووی کرد وگوازرایەوە پێغەمبەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سەردانی کردووە، ماوەیەکی زۆر تەمەنی کردووە، وزۆرێك فەرموودەشی گێڕاوەتەوە. کەسانێکی وەکو: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدولرەحمان وسولەیمانی کوڕی یەسار وعوبادەی کوڕی وەلیدی کوڕی عوبادە، وعەمری کوڕی شوعەیب وخالیدی کوڕی زەکوان وعەبدولای کوڕی موحەمەدی کوڕی عەقیل وکەسانێکی تریش فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە.

باوکی یەکێك بووە لەو پیاوە گەورە بە تەمەنانەی کە لە غەزای بەدردا بەشداری کردبوو، وهەر ئەویش ئەبو جەهلی کوشت، خۆشی لە سەردەمی خەلافەتی (عبد الملك)دا لە ساڵی حەفتاو ئەومنە (**بضعة وسبعون**) کۆچی دوایی کرد.[1]

ئەم ئافرەتە خۆی بەیعەتی کردووە بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ویەکێکە لە ئافرەتە گەورە وپایەدارەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کە لەگەڵ پیاواندا جیهادی کردووە، ئیاسی کوڕی بەکیری لەیسی خوازبێنی کردبوو، پاشان خۆی ودوو براکەشی لە مەکە دەرچوون. لە پاش غەزای بەدر شووی پێ کرد، ئیتر پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) هەر ئەو بەیا نییەی کە تازە گوازرابووەوە سەردانی کرد وهات بۆلای، بینی ئەوا چەند کەنیزەکێك دەف لێ دەدەن ودەگرین بۆ ئەو پیاو وباوکانەی کە لە غەزاکەدا کوژرا بوون، ئەم ئافرەتە لە غەزای ئوحودیشدا بەشداری کردووە لەگەڵ ئوم عەمارە ودایکە عائیشەدا (خوایان لێ ڕازی بێت).

---

(١) سير أعلام النبلاء/ ٣/ ١٩٨.

## ٤- (أم سنان الأسلمية)

ژنە هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبەر بوو (صلى الله عليه وسلم)، کە فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) گێڕاوەتەوە، (ابن عباس) وکچەکەی خۆشی کە ناوی (سبيتة بنت حنظلة الأسلميّة)، فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە.

یەکێك بووە لە هاوەڵە جەنگاوەر وجیهادکەرەکان، کە بە زیرەکی و چاونەترسی وهورە بەرزی وەسف کراوە، کاتێك کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ویستی ڕوو بکاتە خەیبەر، ئەویش هاتە خزمەتی، وفەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا، پێم خۆشە لەگەڵ تۆدا دەر بچم، گوندەی ئاوەکان بدوورمەوە، وبریندار وزامارەکان چارسەر وتەداوی بکەم، یارمەتی موجاهیدەکان بدەم، شت ومەکەکانیان بۆ بپارێزم، ئاو بدەم بە تینوەکانیان. پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: وەرە لەگەڵمان، لەگەڵ (ام سلمة)دابە. کە لە زۆرینەی کاتەکاندا لە خزمەتی پێغەمبەردا بوو (صلى الله عليه وسلم).[1]

## ٥- (ليلى الغفارية)

یەکێکە لە ژنە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کە لەخزمەت پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) دەچووە غەزا کردن، کە خۆی دەفەرموێت: لە خزمەت پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) چووم بۆ غەزاکردن[2]، وبریندارەکانم تیمار دەکرد، وبەسەر نەخۆشەکاندا دەهاتم ودەگەڕام، لە

---

(١) أسد الغابة/ ٥/ ٥٩٢، والإصابة/٤/ ٤٦٢.
(٢) الثقات لابن حبان/ ٣/ ٦١.

کاتێکیشدا کە ئیمامی عەلی ڕۆیشت بەرەو بەصرە منیش لەگەڵیدا ڕۆیشتم.[١]
لە ساڵی (٤٠)ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

## ٦- (كعيبة بنت سعيد الأسلمية)

یەکێکە لە ئافرەتە بەڕێز ودەست گوشادەکان، موجاهیدێکی پایەداری هاوەڵە موجاهیدەکان بووە، لە غەزای خەیبەردا لە خزمەت پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) ئامادە بوو، پێغەمبەریش وەکو پیاوێك بەشی بۆ دانا لە غەنیمەو دەسکەوتەکان، وەکو ئیمامی واقیدی بۆمان دەگێڕێتەوە.[٢]

## ٧- (رفيدة الأنصارية)

ئیبنو حەجەر(ی عەسقەلانی) لە بارەیەوە فەرموویەتی: ڕەفیدەی ئەنصاری یان ئەسلەمی، ئیبنو ئیسحاق لە چیرۆکەکەی سەعدی کوڕی موعازدا باسی کردووە کە لە غەزای خەندەقدا بە تیر پێکرا، پاشان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: بیخەنە خێمەکەی ڕەفیدەوە، کە لە مزگەوتدایە، هەتاوەکو لە کاتێکی نزیکدا سەردانی دەکەم. ئەم ئافرەتە تیماری بریندارانی دەکرد، خۆشی تەرخان کردبوو بۆ ئەو موسوڵمانانەی کە کێشەیەکیان هەیە، یان پێویستیان بە خێر وچاکەیەك هەیە.[٣]

ئیتر هەر بەم شێوەیە ئەم ئافرەتە بەردەوام بوو لە سەردەمی یەکەمدا، بەشداری شەڕەکانی دەکرد، ڕۆڵی دەبینا لە پاراستنی نەتەوەی موسوڵمانان، وبەرگری کردن لە مافەکان، ولە تەواوی نیشتمان. ئیتر ئەم ویست وئارەزوانەی

---

(١) الإصابة لابن حجر/ ٨/ ١٠٦.
(٢) الاستيعاب لابن عبد البر/ ٤/ ١٩٠٧.
(٣) الإصابة لابن حجر/ ٧/ ٦٤٦.

ئافرەت گەشەی دەکرد، هەتاوەکو گەیشتە ڕادەی سەرکردایەتی کردنی سوپای موسوڵمانان، کە لە ڕێگەی خوادا جیهادیان دەکرد، کە ئێمە تەنها یەك ئافرەت باس دەکەین کە سەرکردایەتی سوپای موسوڵمانانی کردووە، کە ئەویش بریتیە لە: (ترکان خاتوون).

## سەرکردەی سوپا ترکان خاتون

ناوی ترکان خاتونی کچی (**طغراج**)ە شازنی (جەلالیەکان) بووە، فەرمانڕەوای شاری ئەصفەهان بووە، ژنی سوڵتان (**ملکشاه**) بووە، ئافرەتێکی گەورە وپەروەردەکەری عەقڵ وبیر وبۆچوون ودین وچاکەکاری وخاوەن دەسەڵات وجەماوەر بووە، لە نەوەی (**افراسیاب**) پاشای فارسەکان بووە. هاوبەشی مێردەکەی کردووە لە دەسەڵات وبەڕێوەبردندا، لە دوای مردنی ئەویش خۆی هەستاوە بە بەڕێوەبردن وسەرپەرشتیاری وڕێکخستنی کاروبارەکان، ئەوەبوو چەند ڕاوێژکار ووەزیرێکی بۆ خۆی دانا، وچەند فەرماندەیەکی سووپاشی دامەزراند، ماڵی بازرگانانی ولاتی پاراست، و کاریگەریەکی زۆر گەورەی هەبوو لە ولاتی فارسدا، وەك ئەوەی کە زۆرێك لە داب ونەریت وڕەوشتی خەڵکی ولاتەکەی گۆڕی، بەخشش ومووچەی بۆ دابین کردن، بەمەش هەم کاربەدەستەکان وهەم خەڵکە بندەستەکانیش خۆشیان دەویست، ژن وژن خوازی لەگەڵ خەلیفەی عەباسیەکان (**المقتدي بأمر الله**) کرد، ئەوەبوو کە خەلیفە کچێکی ئەوی هێنا بۆ خۆی، لە ساڵی (٤٨٧)ی کۆچیدا وەفاتی کردووە.[١]

ئەوەی کە تاوەکو ئێستا باسمان کرد کەمێکە لەو بەشداری کردنە زۆرەی ئافرەتان لە جەنگ وسوپای موسوڵمانەکاندا. بەلام بە پێشینەیەکی شارستانی

---

(١) أعلام النساء/ ١/ ١٦٩.

دادەنرێت لەسەر دانپیانان بە ڕۆڵی ئافرەت لە زۆر لایەنی ژیانەوە، بەڵکو بە کارێکی کەم وێنە دادەنرێت کە ڕۆژئاوا لەگەڵ ئەوەشدا کە گۆرانی بەسەر ئازادی ودیموکراتیدا دەڵێت، نەیتوانیوە جێبەجێی بکات وبیهێنێتەدی.

# بەشی چوارەم

## ئافرەتگەلێکی موفتی و زانا

لە سەرجەم قۆناغەکانی مێژووی ئیسلامیدا هەزاران ئافرەتی زانا وبە تواناو سەرکەوتوو لە هەموو جۆرە زانستەکان وسەرجەم بوارەکانی ڕۆشنبیری عەرەبی ئیسلامیدا هەڵکەوتوون ودەرکەوتوون. شێخی ئیبو حەجەر لە کتێبەکەیدا بە ناوی: (الإصابة في تمييز الصحابة) ژیاننامەی (١٥٤٣) هەزار و پێنج سەد وچل وسێ ئافرەتی نووسیووە، کە هەندێکیان شەرع زان بوون و هەندێکیشیان فەرموودەناس وهەندێکیشیان شارەزای ئەدەب بوون. هەریەکە لە ئیمامی نەوەوی لە کتێبەکەیدا بە ناوی: (تهذيب الأسماء واللغات)، خەتیبی بەغدادی لە کتێبەکەیدا بە ناوی: (تأريخ بغداد)، سەخاوی لە کتێبەکەیدا بە ناوی: (الضوء اللامع لأهل القرن التاسع)، عومەر رمزا کەحالە لە کتێبی: (معجم أعلام النساء)، کەسانێکی تریش لەوانەی کە کتێبی ژیان وڕیزبەندی زانایانیان داناوە، هەموو ئەمانە باسیان لە ژیانی کۆمەڵە ئافرەتێکی شەرعزانی فەرموودەناسی تەفسیرزانی ئەدیبی شاعیر کردووە.

بەڕاستی ئافرەتانێکی زۆر پێش کەوتوون لە پیاوان لە زۆر لایەنی زانستی شارستانی ئیسلامیدا، بە تایبەتی لە لایەنی زانستی فەرموودە وناسینی ئەو کەسانەی کە فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، زانایان وشارەزایان وپێشەوایانی زانستی فەرموودە خۆیان ئەم شایەتیەیان بۆ تۆمار دەکەن. ئەوەتا ئیمامی زەهەبی دەفەرموێت: ((ئافرەتێك ناناسم کە تۆمەتبار کرابێت، یان فەرموودەی لێ

ومرنەگیرابێت)).[١] بۆ دووپات کردنەوەی ئەو ڕاستیەش شێخی ئیبنو حەجەر دەفەرموێت: ((ئافرەتێك شارەزا نیم کە تۆمەتبار کرابێت یان فەرموودەی لێ ومرنەگیرابێت)).[٢]

ئافرەتانی سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆر سوور بوون لەسەر گەڕان بە شوێن زانستی شەرعی وگرنگی پێدانی ئەو زانستە. ئەوەتا ئەبو سەعیدی خودری وئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە کە: ئافرەتان پرسیان لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): ڕۆژێکمان بۆ دیاری بکە وەکو چۆن ڕۆژێکت بۆ پیاوان دیاری کردووە. ئەفەرموێت: ئیتر ئافرەتان دەهاتنە خزمەتی وئەویش ئامۆژگاری دەکردن وفێری دەکردن.[٣]

عەتائی کوڕی رەباح لە بارەی دایکە عائیشەوە دەفەرموێت: ((عائیشە لە هەموو کەسێك شەرعزان تر بوو، لە هەموو کەسێکیش زانا تر بوو، لە هەموو کەسێکیش بۆچوونەکانی چاك تر وجوان تر بوو)).[٤]

بە هەمان شێوە تەواوی دایکانی ئیمان داران (خێزانەکانی پێغەمبەر) هەموویان، زۆرینەی ئافرەتانی هاوەڵی پێغەمبەر، کە ژمارەیەکی زۆر بوون کە

---

(١) ميزان الاعتدال في نقد الرجال، للإمام الذهبي/ ٧/ ٤٦٥.

(٢) لسان الميزان، للحافظ ابن حجر العسقلاني/ ٧/ ٥٢٢.

(٣) ابن أبي شيبة في مصنفه في مصنفه/ كتاب الجنائز/ في ثواب الولد يقدمه الرجل/ ١١٨٧٦، هەروەها لە چەند کتێبێکی تری فەرموودەکانی حەزرەتدا ئەم فەرموودەیە هاتووە، بەڵام بە تەعبیری جیاواز، وەکو: (البخاري/ كتاب العلم/ باب هل يجعل للنساء يوم على حده في العلم/ ١٠١، وأحمد في مسنده/ مسند المكثرين من الصحابة/ مسند أبي سعيد الخدري/ ١١٣١٤، ابن حبان في صحيحه/ كتاب الجائز/ باب ما جاء في الصبر وثواب الأمراض والأعراض/ ٢٩٤٤، والنسائي في السنن الكبرى/ كتاب أهل العلم بالعلم إلى البلدان/ هل يجعل العالم للنساء يوما على حدة في طلب العلم/ ٥٨٩٦).

(٤) الحاكم في المستدرك/ كتاب معرفة الصحابة/ تسمية أزواج رسول الله (صلى الله عليه وسلم) في الجاهلية والإسلام/ ٦٧٤٨، والذهبي في سير أعلام النبلاء/ ٢/ ١٨٥. هەروەها ئەم وتەیە لەم سەرچاوانەشدا هاتووە: الاستيعاب/ كتاب النساء وكناهن/ عائشة بنت أبي بكر/ ١/ ٦٠٩، الإصابة في تمييز الصحابة/ ٨/ ١٨، وتهذيب الكمال ليوسف ابن الزكي المزي/ ٣٥/ ٢٢٤، وتهذيب التهذيب للعسقلاني/ ١٢/ ٤٦٣.

بەشداریان کردووە لە بزووتنەوەی زانستی شارستانێتی ئیسلامی، کە ئێمە توانای کۆکردنەوەیانمان نییە لەم کتێبەدا، کە دەکرێت بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێینەوە بۆ ئەو کتێب وسەرچاوانەی کە ناومان هێنان. وەئێمە لەمەولا تەنها چەند نموونەیەکی کەم بە کورتی باس دەکەین لە ژیانی ئەو ئافرەتە زانا وشارەزایانەی پاش سەردەمی هاوەڵانی پێغەمبەر.

## ١- ( نفيسة العلم )

ئیمامی (الذهبي) لەبارەیەوە دەفەرموێت: ئافرەتێکی پایەداری بەڕێزی چاکەکار بووە، کچی حەسەنی کوڕی زەیدە، لە نەوەی ئیمامی حەسەن و ئیمامی عەلی یە. گۆڕەکەی لە جێگەیەکی گەورەی ناسراوە { لە گەڕەکێکدا بووە، کە ئەوکاتە پێیان دەوت (درب السباع) بەڵام دواتر ئەو گەڕەکە لابرا، ئێستاش بە مزگەوتی سەیدە نەفیسە بەناوبانگە } لە نێوان میصر وقاهیرە[1]. باوکی لە لایەن خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنصورەوە کرا بە فەرمانڕەوای شاری مەدینەی پیرۆز، پاشان لایبرد وبۆ ماوەیەك خستیە بەندیخانەوە لە شاری بەغدا، ئەوجا کاتێك کە مەهدی بوو بە خەلیفە، ئازادی کرد و ڕێزی لێنا و ماڵ و موڵکەکەی بۆ گەڕاندەوە، ولەگەڵیشیدا چوو بۆ حەج کردن (هەندێك لە زانایان دەفەرموون: لەو سەفەرەی حەجەدا وەفاتی کرد، ولە جێگەیەك کە پێنج میل لە شاری مەدینە دوورە ئەسپەردە کراوە)...

---

(١) ئەم تەعبیرە لە زۆرێك لە کتێبە مێژوویەکاندا دەبینرێت، پێم وایە دەکرێت کە جێگە وناوچەیەك یان شارێك هەبێت لە وڵاتی مصر کە بە تایبەتی پێی بوترێت مصر، نزیکیش بێت لە شاری قاهیرەوە، ئەگینا ئەگەر وا نەبێت، خۆ قاهرە پایتەختی میصرە!! وە هیچ مانایەکیشی نییە کە بوترێت لە نێوان مصر وقاهرە. هەروەکو چۆن شارێك هەیە لە تونس بە ناوی تونس، وە لە جەزائیر بە ناوی جەزائیر، وە بە شاری دیمەشقی پایتەختی سوریا دەوترێت: (شام) لە هەمان کاتدا خۆی وشەی (شام) بۆ هەر چوار وڵاتی ئوردون وسوریا ولوبنان وفەلەستین بەیەکەوە بەکار دێت. (وەرگێڕ)

ئەوجا ئەم خانمە بەڕێزە لەگەڵ مێردە پایەدارەکەیدا کە ناوی ئیسحاقی کوڕی جەعفەری کوڕی موحەممەد صادق بووە _ وەکو وتراوە _، لەو شارەوە چوون بۆ میصر، وهەر لە میصریش وەفاتی کردووە لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٢٠٨)ی کۆچی. ئێمەش هەواڵی ئەم ئافرەتە پایەبەرزەمان زۆر پێ نەگەیشتوە... بەڵام وتراوە کە ئافرەتێکی چاکی خواپەرست بووە، وپاڕانەوەش لای گۆڕەکەیدا وەردەگیرێت وقبووڵ دەبێت.[1]

ڕۆژی چوارشەممە (١١)ی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی (١٤٥)ی کۆچی لە شاری مەکەی پیرۆز لەدایك بووە، تاوەکو تەمەنی گەیشتوەتە پێنج ساڵ هەر لەوێ ماوەتەوە، وزۆر بە ڕێز وسەربەرزیەوە لە مەکەدا ژیاوە، هەتاوەکو باوکی لەگەڵ دایکیدا (کە زەینەبی کچی حەسەنی کوڕی حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی)یە بردوونی بۆ شاری مەدینەی پیرۆز، ئیتر لەوێ دەچوو بۆ مزگەوتەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وگوێی لە زانایان وشێخەکان دەگرت، ودەرسی حەدیس وفیقهی لە خزمەتی زانایاندا دەخوێند، هەتاوەکو نازناوی (**نفيسة العلم**)ی بە دەست هێنا، بەر لەوەی بگاتە تەمەنی شوو کردن. جا کاتێك کە گەیشتە ئەو تەمەنە، ئیتر گەنجەکانی خزم وکەسوکاری خۆی کە لە ئالوبەیتی پێغەمبەر بوون (صلى الله عليه وسلم)، حەزیان لێ کرد، وخوازبێنیان دەکرد، بەڵام باوکی زۆر بە جوانی وەڵامی دەدانەوە ونەیدەدا پێیان، هەتاوەکو ئیسحاقی کوڕی جەعفەری صادق هات وبوون بە هاوسەری یەکتر، بەمەش بەو هاوسەرگیریە هەردوو نووری حەسەن وحوسەین کۆبوونەوە، ونەفیسە

---

(١) سير أعلام النبلاء للذهبي/ ١٠/ ١٠٦_ ١٠٧.

هەروەها ئەم زانیاریانە لە هەردوو کتێبی/ البداية والنهاية، لابن كثير/ ١٠/ ٢٦٢، والوافي في الوفيات، للصفدي/ ١/ ٣٣٥٨ دا دەست دەکەون. وە ئەم وتەیەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پیشینە خواناسەکانی ئێمە ئەو خانمەیان بە چاك زانیووە، و بە درووستیشیان زانیووە کە لەلای گۆڕی چاکەکاراندا نزا وپاڕانەوە بکرێت، بە تەوەسسول کردن بە ئەوانەوە، بە هیوای ئەوەی کە خوای گەورە نزا وپاڕانەوەکانمان لێ وەرگرێت، وەك لەو سەرچاوانەدا هاتووە. (وەرگێڕ)

خاتوونیش بوو بە خانمی هەردوو ماڵەکە، وپاشان کوڕێکیان بوو بە ناوی: **(القاسم)**، کچێکیش بە ناوی: **(أم كلثوم)**.

بە زۆری کاتەکانی لە خزمەت مزگەوتی باپیریدا (پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)) بەسەر دەبرد. بە ڕاستی وبێ زیادەڕەوی، ئافرەتێکی دونیا نەویست بوو، نەك بەو جۆرەی کە هەموو پەیوەندیەکی لەگەڵ ژیاندا بچڕاندبێت، بەڵکو وازی لە هەموو ئەو شتانەی دونیا هێنابوو کە ڕێگر دەبوون لە ڕێگەی خواپەرستی وکۆکردنەوەی توێشوودا. پاشەڕۆژی زۆر لەبەرچاو گرتبوو، تاوەکو ئەو ڕادەیەی کە بە دەستەکانی خۆی گۆڕی بۆ خۆی هەڵکەندبوو، کە دواتر تێیدا ئەسپەردە کرا. هەموو قورئانی لەبەر بوو، تەفسیرێکی باشیشی دەزانی، خەڵکانێك ڕوویان تێ دەکرد بۆ ئەوەی گوێ لە تەفسیر کردنی بگرن، هەرکاتێك کە دەپاڕایەوە دەیوت: خوایە زیارەت وسەردانی گۆڕی دۆست وخۆشەویستەکەی خۆت **(إبراهيم)**م بۆ ئاسان بکە، خوای گەورەش بەدەم پاڕانەوەکەیەوە هات وخۆشی ومێردەکەشی **(إسحاق المؤتمن)** زیارەتیان کرد.

پاشان چوون بۆ میصر لە ڕەمەزانی ساڵی (١٩٣)ی کۆچی لە سەردەمی هارونە ڕەشیددا، لە عەریش _ کە ئەوپەڕی باکووری ڕۆژهەڵاتی میصرە _ خەڵکی میصر بە **(الله أكبر، ولا إله إلا الله)** پێشوازیان لێ کردن، وبە خێوەت و ئەسپ وولاغی سواری دەوری خۆی ومێردەکەشیان دا، هەتاوەکو لە ماڵی گەورە بازرگانێکی ئەو کاتە بە ناوی **(جمال الدين عبد الله الجصاص)** دابەزین و مانەوە.

لە ڕۆژی شەممەی (٢٦)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٩٣)ی کۆچیدا نەفیسە خانم گەیشتە قاهیرە، واتە پێنج ساڵ بەر لە هاتنی ئیمامی شافیعی بۆ وڵاتی میصر، لە ماڵی ئافرەتێکی میصری مایەوە بە ناوی **(أم هانئ)**، کە خانوو وماڵێکی بە دەرفەت وفراوان بوو، پاشان خەڵك دەستیان کرد بە سەردانی بۆ فێربوونی زانست، هەتاوەکو زۆر فەرەباڵغ بوو، بە جۆرێك کە وەخت بوو وەهای لێ بێت

کە نەیپەرژێتە سەر ئەو جۆرە خواپەرستیانەی کە پێشتر دەیکردن، بۆیە هاتە دەرەوە بۆلای خەڵکەکە وفەرمووی: ((من بڕیارم دابوو کە لای ئێوە بمێنمەوە، بەڵام من ئافرەتێکی لاوازی بێ هێزم، ئەوەتا دەشبینن کە خەڵك لە دەورم زیاد بوون، وسەرقاڵیان کردووم کە ویرد وزیکرەکانی خۆشم پێ ناخوێنرێت، وپێشم ناکرێت کە توێشوو بۆ پاشەڕۆژم کۆبکەمەوە، خۆشەویستی وسۆزی مەرقەد وگۆڕی باپیرەشم زۆری بۆ هێناوم))، ئیتر خەڵکەکەش زۆر لە قسەکەی ترسان، بۆیە ڕێگەیان پێ نەدا کە بەجێیان بهێڵێت، هەتاوەکو والی وفەرمانڕەوای ئەو کاتە (السري بن الحكم) خۆی هاتە ناو مەسئەلەکە، وپێی وت: ((ئەی کچی پێغەمبەری خوا، هەر سکاڵا وکێشەیەکت هەبێت، من دەیمە کەفیلی نەهێشتنی))، ئەوەبوو خانوویەکی فراوانی بە دیاری پێدا، ودواتر مەوعیدێکی بۆ دانان کە خەڵك بۆ زانیاری وئامۆژگاری بێتە خزمەتیان _ هەفتەی دوو ڕۆژ _ بۆ ئەوەی کە پێنج ڕۆژەکەی تر سەربەست ودەست خاڵی بێت بۆ عیبادەت وخواپەرستی خۆی، ئیتر ئەویش ڕازی بوو، لەوێ مایەوە.

فەرمانڕەوا وکاربەدەستەکانیش باش دەیان زانی کە چەندە بە ڕێز وبە توانایە بۆ ڕێنموویی کردنی تەواوی خەڵکی، بەڵکو لە کاتی پێویستیشدا خەڵکی هاندەدا لەسەر شۆڕش کردن، ئەگەر پێویس بوایە، هەتاوەکو جارێك پیاوەکانی یەکێك لە کاربەدەستەکان پیاوێکیان لە دۆستەکانی خاتوو نەفیسە دەستگیر کردبوو، بۆ ئەوەی کە سزای بدەن، جا لە کاتێکدا کە ئەو پیاوە لەگەڵ پیاوانی کاربەدەستەکاندا بەلای ماڵی خاتوو نەفیسەدا تێپەڕی، وهاواری کرد کە بێنە هانایەوە، ئەویش بانگی کرد کە بەرەڵای بکەن، وفەرمووی: ((خوای گەورە بەر چاوی ستەم کارانت لێ بگرێت)). جا کاتێك کە پیاوەکەیان هێنایە بەردەستی ئەمیر وکاربەدەستەکە، پێیا گوت کە تێپەڕیون بەلای خاتوو نەفیسەدا، وپیاوەکەش داوای بە هاناوە هاتنی لێ کردووە، وداوای دوعای لێ کردووە، وئەویش دوعای بۆ کرد کە ڕزگاری ببێت، کاربەدەستەکەش وتی: ((خوایە دەبێت ستەمکاری من گەیشتبێتە ئەم ڕادەیە! خوایە پەشیمانم،

وداوای لێ خۆشبوونت لێ دەکەم. ئیتر پیاوەکەی بەرەڵا کرد وهەندێك ماڵیشی کرد بە خەیر وچاکە بۆ گەدا ونەدار وهەژاران)).

ئیمامی **(قرماني)**[1] لە **(تأريخ)**ەکەیدا باسی شتێکی کردووە، کە خاوەنی کتێبی **(الغرر)**، وکتێبی **(المستطرف)**یش پشتگیری لەو ڕیوایەتەی دەکەن _ کە هەردووکیان لە مێژوو نووسە متمانەدارەکانن _: گوایە خاتوو نەفیسە سەرپەرشتی شۆڕشێکی خەڵکی کردووە دژ بە **(ابن طولون)**، کاتێك پەنایان بۆ هێنا لە ترسی ستەم ودەست درێژیەکانی، ئەویش پەڕەیەکی نووسی وکاتێك کە زانی ئاپۆڕەی وڵاغ وپاسەوان ودارو دەستەکەی **(ابن طولون)** لەوێوە تێدەپەڕن، چووە دەرەوە بۆ سەر ڕێگەکەی، جا ئەویش کاتێك کە خاتوو نەفیسەی بینی، لە سواری وڵاغەکەی هاتەخوارەوە، خاتوو نەفیسەش ئەو پارچە پەڕەیەی پێدا کە تێیدا نوسیبووی: ((بوون بە کاربەدەست وخەڵکیتان دیل کرد، دەسەڵاتتان کەوتە دەست وخەڵکیتان پێ چەوساندەوە، فەرمانڕەواییتان درایە دەست، ودەستان کرد بە خراپە کاری، بژێوی وڕۆزیتان درایە دەست، ئێوەش بڕیتان، ئەمەو ئەوەش دەزانن کە تیری سبەینیان دەپێکێ وهەڵە ناکات، بە تایبەتی لەو دڵانەی کە ئازارتان پێ گەیاندوون، لەو سکانەی کە برسیتان کردوون، لەو لاشانەی کە ڕووتتان کردوونەتەوە، ئەوەش شتێکی مەحاڵ وچاوەڕوان نەکراوە کە ستەم لێکراو بمرێت وستەمکار هەر بمێنێتەوە، ئیتر چیتان پێ دەکرێت بیکەن، ئێمەش سکاڵا بۆلای خوا دەبەین، وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ )).

---

(١) ناوی ئەحمەدی کوڕی سنان الدینی کوڕی ئەحمەدی دیمەشقیە. لە ساڵی (٩٣٩)ی کۆچی لەدایك بووە، ولە ساڵی (١٠١٩)ش کۆچی دوایی کردووە، وە یەکێك لەو کتێبانەی کە دایناون بریتیە لە کتێبێکی مێژوویی بە ناوی (اخبار الدول واثار الاول) کە لە یەك بەرگ پێك هاتووە، دابەشی کردووە بۆ پێشەکیەك وپەنجا وپێنج دەروازە. بڕوانە: (کشف الظنون/ ١/ ١. وهدية العارفين/ ١/ ٨٦). (وەرگێڕ)

ئیمامی (**قرماني**) دەفەرموێت: ئیتر لەو کاتە بەدواوە (**ابن طولون**) بە دادپەروەرانە ڕەفتاری دەکرد ودەجولایەوە!.

لە کاتێکدا کە ئیمامی شافیعی تەشریفی هێنایە میصر، پەیوەندیەکی بتەوی بە خاتوو نەفیسەوە بەست، کردبووی بە عادەت کە هەرکاتێك بچوایە بۆ هەڵقەکانی دەرس وتنەوە لە مزگەوتی (**فسطاط**)، وهەرکەی بیشگەڕایەتەوە بۆ ماڵەوە، سەردانی ئەویشی دەکرد، لە مانگی ڕەمەزانیشدا ئیمامی شافیعی پێش نوێژی تەراویحی لە مزگەوتەکەی ئەودا دەکرد، وهەرکاتێك بچوایە بۆ لای داوای دوعای خەیری لێ دەکرد، هەتاوەکو دەگێڕنەوە کە ئەگەر نەخۆشیش بوایە، کەسێکی دەنارد بۆ لای وسەلامی پێ دەگەیاند، وپێی دەوت: ((کوڕەمامەکەت کە شافیعیە نەخۆشە وداوا دەکات دووعای بۆ بکەیت)). ئیمامی شافیعی وەسێتی کردبوو کە خاتوو نەفیسەش نوێژی جەنازەی لەسەر بکات، جا پاش ئەوەی کە وەفاتی فەرمووە، لە ساڵی (٢٠٤)ی کۆچی، تەرمەکەیان بەلای ماڵی خاتوو نەفیسەدا تێپەڕاند، ئەویش نوێژی لەسەر کرد، ووەسێتەکەیان جێبەجێ کرد.

ئافرەتێك بوو کە زۆر دەگریا، وبەردەوام بەڕۆژوو بوو، شەونوێژی دەکرد، سێ شەو جارێك نانی دەخوارد، وبە بێ مێردەکەی هیچ شتێکی نەدەخوارد، وسی جار حەجی ماڵی خوای کردووە، کە زۆر بە توندی دەگریا ودەستی دەگرت بە دیوارەکانی کەعبەوە، ودەیوت: پەروەردگار وگەورە وسەردارم خۆشحاڵم کە بە لێ ڕازیببوونم.

زەینەبی کچی یەحیای (**المتوج**) دەڵێت: چل ساڵ خزمەتی پوورە نەفیسەم دەکرد (خوشکی باوکی بووە)، نەمبینیوە کە بە شەودا بخەوێت، ونەشمبینیوە کە بە ڕۆژدا هیچ بخوات، بۆیە جارێك پێم وت: ئەوە بەزەییەکت بە خۆتا نایەتەوە؟! ئەویش فەرمووی: چۆن بەزەییم بە خۆمدا بێتەوە کە لە

بەردەممدا چەندین هەوراز ورێگر هەن، کەسێك کە بـراوە وبەختـەوەر نـەبێت ناتوانێت لێیان تێپەڕ ببێت.

پاش ئـەوەی کـە حـەوت سـاڵ لـە میصـر مایـەوە، خـاتوو نەفیسـە نـەخۆش کەوت، ئیتر نامەیەکی نارد بۆ (**إسحاق المؤتمن**)ی مێردی، وگۆڕێکی لـە ماڵەکەی خۆیدا بە دەستی خۆی هەڵکەند، کە زۆر جار دەچوە ناوی ونوێژی تێدا دەکرد، وهەر لەناو ئەو گۆڕەدا سـەد ونـەوەد (١٩٠) جـار قورئـانی خـەتم کـردووە، ئـیتر هەروا بۆی دادەبەزی ونوێژێکی زۆری تێدا دەکرد، وقورئانێکی زۆری دەخوێند، وزۆریـش دەگریـا، هـەتاوەکو لـە سـاڵی (٢٠٨)ی کۆچی کەوتـە گیانـدان ونزیـك بوویەوە لە مردن، ولـەو کاتەشـدا بـەڕۆژوو بـوو، بۆیـە خـەڵکی زۆریـان لێ کـرد ووازیان لێ نـەدەهێنا لەسـەر ئـەوەی کـە دەبێـت ڕۆژوەکـەی بشکێنێت، ئـەویش فەرمووی: ئای چەندە سەیرە، ماوەی سی (٣٠) ساڵە داوا لە خـوا دەکـەم کـە بـە زمانی بە ڕۆژوو پێـی بگەمـەوە، ئێسـتا ڕۆژوەکـەم بشکێنم! شـتی وەهـا نابێـت، پاشان دەسـتی کـرد بـە خوێنـدنی سـوورەتی (**الأنعام**) وئـە شـەوە شـەوێکی زۆر ئـارام وکـپ بـوو، هـەتا گەیشـتە ئایـەتی: ﴿لَهُمْ دَارُ السَّلَامِ عِندَ رَبِّهِمْ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ الأنعام/ ١٢٧. ((واتە: ئەوانـەی ڕوو دەکەنـە ئـەم ڕێگـا ڕاسـتەی خـودا، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا ئەمینن ودڵنیان وئاشـتی وخۆشـیان لەلایـەن خـوداوە بـۆ دابـین کـراوە. ئەوانـە خـودا پشـتیوان ویارمەتیدەریانـە وبـەهۆی ئـەو کـردەوە چاکانـەیانەوە کە لـە ژیـانی دنیـادا دەیـانکرد، ڕەحمـەت ولوتـف وبـەزەیی خـۆی دەرژێنێت بەسەریاندا)). ئیتر لە هۆشی خـۆی چـوو، وپاشـان شـەهادەتی ڕاسـت وحەقی هێنا، وگیانی بە سۆز وڕەحمەتی خوا سپارد.

## ٢- خاتوو (كريمة) گێڕەرەوەی صەحیحی بوخاری

زانــای پایــەدار وفــەرمووودەگێڕەوە وزۆر بــەڕێز خــاتوو کەریمــەی کچــی ئەحمــەدی کــوڕی موحەمــەدی کــوڕی حاتــەمی مەروەزیــە، ولــە پــاڵی (**مسجد الحرام**)دا بووە.

صەحیحی بوخاری لەلای سێ کەس گوێ لێگرتووە، کە ئەوانیش: (**أبو الهيثم الكشميهني، وزاهـر بـن احمـد السرخسـي، وعبـد الله بـن يوسـف بـن باموية الأصـبهاني**)، هـەرکاتێك کـە فەرمووودەیـەکی پێغەمبـەری (صلى الله عليه وسلم) بگێڕایەتەوە، ئەوا بەرامبەری پێ دەکرد لەگەڵ ئەصلەکەیدا، زۆر تێگەیشتوو وزانا ودانا بووە لە چاکەکاری وخواپەرستیدا.

زۆر جار کتێبی صەحیحی بوخاری گێڕاوەتەوە، جارێکیان بە خوێندنـەوەی ئەبو بەکر **الخطيب**، لە ڕۆژانی بەجێ هێنانی مەناسیکی حەج کردندا. هەر بە کچێنی مرد وشووی نەکردبوو.

چەند کەسێك فەرموودەی پێغەمبـەریان (صلى الله عليه وسلم) لێ گێڕوەتـەوە، وەکو: (**الخطيب، وأبو الغنائم النرسي، وأبـو طالـب الحسين بـن محمـد الـزينبي، ومحمد بن بركات السعيدي، وعلي بـن الحسـين الفـرّاء، وعبـد الله بـن محمـد بـن صدقة بن الغزال، وأبو القاسم علي بن إبراهيم النسيب، وأبو المظفر منصور بن السمعاني**، کەسانێکی تریش.)

(**أبـو الغنـائم النرسـي**) دەڵێـت: کەریمـە خـاتوون نوسـخەیەکی صـەحیحی بوخاری دەرهێنا، ومنیش لە بەرامبەری دانیشتم، وحەوت پەڕەم لێ نووسیەوە، وخوێندمنەوە، ودەشم ویست کە خۆم بە تەنها بیخوێنمـەوە. ئـەویش فـەرموی نەخێر، دەبێـت جارێ لەگـەڵ منـدا بەیەکـەوە بیخوێنینـەوە، ئـیتر بـە یەکـەوە خزێندمانەوە.

(أبـو الغنـائم) دەڵێـت: ئـەو فەرموودانـەی کـە لـە زاهـیری کـوڕی ئەحمـەدی سەرخەسی بیستبوو، منیش خوێندمەوە لە خزمەتیدا.

وە ئەبو بەکری کوڕی مەنصووری سەمعانی دەڵێت: لە باوکمم بیستووە کە باسی کەریمە خـاتوونی دەکـرد، دەیـوت: ئایـا کەسێك هەیـە کـە وێنـەی خـاتوو کەریمەی بینیبێت؟!

ئـەبو بـەکر دەڵێـت: گـوێم لـە کچـی براکـەی خـاتوو کەریمـە بـوو، دەیـوت: کەریمـە خـاتوون شـووی نـەکردبوو، باوکیشـی خـەڵکی گونـدی (کشمهین) بـوو، دایکیشی لە نەوەی (السياري) بووە، باوکی بردوویەتی بۆ (بيت المقدس) ودواتر گەڕاندیەوە بۆ مەکە، وتەمەنیشی گەیشتبووە سەد (١٠٠) ساڵ.

(ابن نقطة) دەڵێت: بە دەسنوسی ئیبنـو ناصـر مێـژووی وەفاتەکـەی تۆمـار کراوە کە لە ساڵی: (٤٦٥)ی کۆچی بووە.

منیش دەڵێم: ڕاست تر ئەوەیە کە لە ساڵی: (٤٦٣) کۆچی دوایی کردووە.

(هبـة الله بـن الأكفـاني) لـە سـاڵی (٤٦٣)ی کۆچـیدا، دەگێڕێتـەوە لـە عەبدولعەزیزی کوڕی عەلی صۆفی، کە بۆی گێڕاوەوە ووتوویەتی: لە شاری مەکە لـە کەسـێکم بیسـت هـەواڵی مردنـی خـاتوو کەریمـەی پێـدام، کـە گوایـە لـە مانگەکانی ئەو ساڵەدا کۆچی دوایی کردووە.

(أبو جعفر محمد بن علي الهمـداني) دەڵێـت: سـاڵی (٤٦٣) چوومـە حـەج، لـە ڕێگە هەواڵی مردنی کەریمە خاتوونمان پێ گەیش، خۆشم چاوم پێی نەکەوتوە وپێی نەگەیشتووم.[1]

---

(١) سير أعلام النبلاء، للإمام الذهبي/ ١٨/ ٢٣٣.

## ٣- أمه الواحد

ناوی سوتەیتەی کچی حوسەینی کوڕی ئیسماعیلی مەحامیلیە، زاناو شەرعزان وموفتی بووە، لای باوکی خوێندوویەتی، هەر لەویشەوە چەند فەرموودەی گێڕاوەتەوە، تەواوی قورئان وفیقهی ئیمامی شافیعی لەبەر کردووە، زانستی میرات وزمانەوانی وزانستەکانی تری زۆر بە باشی زانیوە، لەگەڵ ئەبو عەلی کوڕی ئەبو هورمیرەدا[1] بەیەکەوە فەتوایان دەدا، دایکی قازی موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی قاسیمی مەحامیلیە، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٣٧٧)ی کۆچی لە دونیا دەرچووە.[2]

## ٤- (شهدة الإبري)

کچی زانای فەرموودە ناس ئەبو نەصر ئەحمەدی کوڕی فەرەجی دەینووری پاشان بەغدادییە لە جیهەتی (الإبري)یەوە، تەمەن درێژ ونوسەر وفەرموودە گێڕەوەی عێراق، ومایەی شانازی ئافرەتان بووە، لە دوای ساڵی (٤٨٠)ی کۆچی لەدایك بووە.

لەم زانایانە فەرموودەی بیستوە: **(أبو الفوارس طراد الزينبي، وابن طلحة النعالي، وأبو الحسن بن أيوب، وأبو الخطاب بن البطر، وعبد الواحد بن علوان، وأحمد بن عبد القادر اليوسفي، وثابت بن بندار، ومنصور بن حيدر، وجعفر السراج، چەندینی تر)**. ئەم زانایانەش فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە: (ابن

---

(١) قازی شەرعزان (حسن بن حسين البغدادي)ە، ویەکێکە لە گەورە زانایانی مەزهەبی ئیمامی شافیعی، لە ساڵی (٣٤٥)ی کۆچی وەفاتی کردووە. بڕوانە: (تأريخ بغداد للخطيب البغدادي/ ٧/ ٢٩٨/ ت: ٢٨٠٨). (وەرگێڕ)

(٢) تأريخ بغداد/ ١٤/ ٤٤٢، وسير أعلام النبلاء/ ١٥/ ٢٦٤، والمنتظم في تاريخ الملوك والأمم لعبد الرحمن ابن الجوزي/ ٧/ ١٣٨.

**عساكر، والسمعاني، وابـن الجوزي، وعبـد الغني، وعبـد القـادر الرهـاوي، وابـن الأخضر، والشيخ الموفق، والشيخ العماد، والشهاب بن راجح، والبهاء عبد الرحمن، والناصح، والفخر الإربلي، وتـاج الـدين عبـد الله بـن حمويـه، وأعـز بـن العليـق، وإبراهيم بن الخير، وبهاء الدين بن الجميزي، ومحمد بن المـني، وأبـو القاسـم بـن قميرة،** خەڵکانێکی زۆر).

**(ابـن الجوزي)** دەفـەرموێت: لـە خزمەتیـدا دەرسـی فـەرموودەم خوێنـدوە، ئافرەتێکی خەت جوان بـوو، شـووی کـرد بـە یـەکێك لـە بریکارەکـانی خـەلیفـە، وتێکـەڵاوی زانایـان وکـۆڕە زانسـتیەکانی کـردووە، ئـافرەتێکی خـەیرۆمەنـد وچاکەکار بووە، نزیکەی سەد (١٠٠) ساڵ تەمەنی کردووە، لە (١٤)ی موحەڕەمی ساڵی (٥٧٤) کۆچـی دوایـی کـرد، وزۆرینـەی خـەڵك وزانایـان ئامـادەی بـەخاك سپاردنەکەی بوون.

**(الشيخ الموفق)** دەفەرموێت: ئیسـنادی حـەدیس لـە بەغـدادا بـە ئـەو دەگـات ولـەودا کۆتـایی دێـت، ئەوەنـدە تەمـەنی درێـژ بـووە کەسـە تەمـەن کەمـەکانی گەیاندوەتە کەسە بەتەمەنەکان (واتە لە کۆڕی دەرس وتنەوەیدا هـەم کەسـانی کەم تەمەن وهەم کەسـانی بـە تەمـەنیش کۆ دەبوونـەوە)، نووسـینێکی جـوانی هەبوو، بەڵام لەبـەر بەساڵاچـوونی خەتەکەیشـی گـۆڕا وجوانێتیەکـەی پێشـتری نەما.[1]

کۆمەڵێکی زۆر لە زانایان لەو ساڵەی ئەودا کۆچـی دوایـان کـردووە، لەوانـە: **(أحمد بن علي بن الناعم الوكيل، وأسعد بن بلدرك بن أبي اللقاء البواب، والأمير شهاب الدين سعد بن محمد بن سعد بن صيفي الشاعر الحيص بيص، وأبو صالح**

---

(١) زۆرینەی ئەو زانیاریانەی کە لەسەر ئـەم خانمـە بـەڕێزە نووسـراوە لـە کتێبـی (تـأريخ الإسلام للذهبي/ ١/ ٤٠٤٦، والمنـتظم في تـاريخ الملوك والأمـم لعبـد الـرحمن ابـن الجـوزي/ ١٠/ ٢٨٨، ووفيات الأعيان وأنباء أبنـاء الزمـان لابـن خلكـان/ ٢/ ٤٧٧) دا هـاتووە، بـەڵام مامۆسـتای دانەر ئاماژەی بـە و سەرچـاوانە نـەکردووە! لەوانەشـە کـە مەبەسـتی کورتبڕی بووبێـت لـە نووسینەکەیدا. (وەرگێڕ)

**سعد الله بن نجا بن الوادي الدلال، وابو رشيد عبد الله بن عمر الأصبهاني، وأبو نصر عبد الرحيم بن عبد الخالق بن يوسف، وعمر بن محمد العليمي، وابو عبد الله بن المجاهد الإشبيلي الزاهد، ومحمد بن نسيم العيشوني).**

## ٥- ( زين العرب بنت عبد الرحمن )

ناوی زین العرب کچی عبد الرحمن کوڕی عومەری کوڕی حوسەینە، وناسراوە بە: (**بنت الخزيراني**). لە زانستی فەرموودەناسیدا گەیشتوەتە پلەی (**محدثة**)، بووە بە سەرپەرشتیاری (**مشيخة رباط بنت السقلاطوني**)، ولە مەکەدا ژیاوە، ولە کۆتایی تەمەنیدا پۆستی (**مشيخة رباط الحرمين**)ی پێ دراوە، ولە سەرەتای ساڵی (٧٠٤)ی کۆچی لە تەمەنی حەفتا ونەوەندە ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.[١]

## ٦- ( دهماء بنت يحيى )

زانای کارخوازی پایەبەرز (**دهماء ی کچی یەحیا**)، خوێندن وزانستی لای براکەی بە ناوی (**الإمام المهدي أحمد بن يحيى**) وەرگرتوە، لە تەواوی ئەم زانستانەدا زۆر لێهاتوو بووە: (**النحو، والأصول، والمنطق، والنجوم، والرمل**[٢]،

---

(١) الدرر الكامنة في أعيان المئة الثامنة لابن حجر العسقلاني/ ٢/ ٢٤٧، وأعلام النساء/ ٢/ ٤٤.
(٢) زانستێکە بە هۆیەوە هەر پرسیارێك بکرێت وەڵامەکەی دەزانرێت، بە هۆی شێوازی هەندێك دەنکە لەوە، کە دوانزە شێوەی هەیە، هەر وەکو بورجەکان، وە زۆرینەی مەسەلەکانی ئەم زانستە شتی گۆترەکاریە، بۆیە دەکرێت کە وەها دەرنەچێت، چونکە زانیارێکان خۆیان بە نزیك کراوەیین، ودڵنیایی نین. بڕوانە: (كشف الظنون/ ١/ ٩١٢). (وەرگێڕ)

والسیمیاء[١]، والشعر)، شەرحی کتێبی (الأزهار)ی[٢] کردووە لە چوار بەرگدا، هۆنراوەی (الکوفی) لە فیقهو میراتدا شەرح کردووە، شەرحی کتێبی (مختصر المنتهی ی ابن الحاجب)ی کردووە (لە زانستی اصول الفقه)، لە شاری (ثلا) لە ولاتی یەمەن چەند کەسێك دەرسیان لا خوێندوەو زانستیان لێوە وەرگرتوە، هەر لەو شارەدا لە مانگی (ذي القعدة) لە ساڵی (٨٣٧)ی کۆچی وەفاتی کردووە.[٣]

## ٧- (فاطمة بنت أحمد)

ناوی فاتیمەی کچی ئەحمەدی کچی یەحیایە، زانایەکی پایەبەرزی شەرعزان بووە، وتوانای هەڵێنجانی ئەحکامە شەرعیەکانی هەبووە، گفتوگۆ ولێکۆڵینەوەی لەگەڵ باوکیدا دەکرد لە مەسەلە بەناوبانگە فیقهیەکاندا، هەر لەگەڵ باوکیدا بە زۆر مەسەلەدا چوونەتەوە، وەکو مەسەلەی خەنە کردن بە

(١) ئەم زانستە جۆرێکە لە جۆرەکانی سیحر کردن، کە وەهات دەخاتە پێش چاو کە وێنەی هەندێك شت دەبینێت، کە تەنها وێنەی خەیاڵین وشتە ڕاستەقینەکان نین. (قاضي بیضاوي) دەفەرموێت: ئەم وشەیە خۆی عەرەبی نییە، بەلاَم کراوە بە عەرەبی، ولە ئەصڵدا لە دوو وشە پێك هاتووە، کە (شیم، ویە)، دواتر کە کراوە بە عەرەبی بووە بە سیمیاو. بڕوانە: (تفسیر روح المعاني، للآلوسي/ ١٦/ ٢٢٧ لە تەفسیری ئایەتی (٦٦)ی سورەتی (طه) کە دەفەرموێت: فإذا حبالهم وعصیهم یخیل إلیه من سحرهم أنها تسعی). (وەرگێڕ)

(٢) ئەم کتێبە ناوی: الأزهار في فقه الأئمة الأطهار. لەسەر مەزهەبی زەیدیەکانە، دانەرەکەشی ناوی: أحمد في مسنده بن یحیی بن مرتضی الیمني)ە، کە یەکێکە لە پێشەوایانی شیعە مەزهەب، ولە ساڵی (٨٤٠) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: (کشف الظنون/ ١/ ١، وهدیة العارفین/ ١/ ٦٦). (وەرگێڕ)

(٣) البدر الطالع للشوکاني/ ١/ ٢٤٨، وأعلام النساء/ ١/ ٤٢٠، والأعلام للزرکلي/ ٣/ ٥.

مـادەی (العصـفر)[١]، جـا بـاوکی دەیـوت: ((بەڕاسـتی فاتیمـە لـە هـەڵێنجانی بڕیارەکاندا بۆلای خۆی دەگەڕێتەوە)).

جا ئەم وتەیەی باوکی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زۆر بە توانـا وهەڵکەوتوو بووە لە زانستەکاندا، چونکە ناکرێت زانایەکی گەورە ئـەم وتەیـە لـە وەسـفی کەسێکدا بڵێت، مەگەر ئەو کەسە کەسێکی زۆر شیاو بێت.

وە مێردەکەشی کە پێیـان وتـوە: (الإمـام المطهـر) لـە هـەر مەسـەلەیەکدا کە ئیشـکالی هەبوایـە دەگەڕایـەوە بـۆ لای ئـەو، ئەگـەر لـە کـاتی دەرس وتنـەوەدا قوتابیـەکان تـەنگاویان بکردایـە وزۆریـان بـۆ بهێنایـە، ئـەویش دەچـوە ماڵـەوە بـۆلای ئـەم خانمـە، وئـەویش ڕاسـتیەکەی پـێ دەوت، ئـیتر ئەهاتـەوە لای قوتابیەکان و، ئەوانیش پێیان دەوت: ئەم زانیاریە هـی خـۆت نییـە، بـەڵکو هـی ئەو کەسەیە کە لە پشتی پەردەکەیە.

لە ساڵی (٨٤٠)ی کۆچیدا وەفاتی کردووە.[٢] کە باوکی هێشتا لە ژیاندا بووە.

## ٨- ( أسماء المهروانية )

نـاوی ئـەسمای کچـی عبـدالله ی کـوڕی محمـدی مـەهرەوا نییـە، ئـافرەتێکی دیندار وچاکەکار وخۆشنوس بووە، وگەیشتوەتە پلەی (محدثة). کتێبـی (روایـة الآباء عن الأبناء)ی (الخطیب البغدادي)[٣] لای ئەم دوو زانایە خوێندوە: (الکمال

---

(١) جۆرە ڕوەکێکە کـە ڕەنگێکـی زەردی لێ دەردێـت، وبـۆ ڕەنـگ کـردن بـەکار دەهێنرێـت. (وەرگێڕ)

(٢) البدر الطالع/ ٢/ ٢٤، وأعلام النساء/ ١/ ٥٦.

(٣) زانای شەرعزانی فەرموودەناسی شافیعی مەزهەب أحمد ی کوڕی علي کوڕی ثابت ی کوڕی أحمـد ی کـوڕی مهـدي کـوڕی ثابـت، کـە بـە الحـافظ أبـو بکـر الخطیـب البغـدادي بەناوبانگە، نزیکەی سەد کتێبی داناوە، لە ساڵی (٣٩٢)ی کۆچی لـە دایـك بـووە، ولـە مـانگی جمـادی الآخـر ی سـاڵی (٤٦٣) کۆچـی دوایـی کـردووە. بڕوانـە (هدیـة العـارفین/ ١/ ٤١). (وەرگێڕ)

**محمد بن محمد بن نصر بن النحاس، والشهاب أحمد بن عبد الغالب بن محمد الماكسيني).**

بیست وشەش (٢٦) زانا ئیجازەیان پێداوە، لەوانە: (**رسلان الذهبي، وأبو بكر بن محمد المزي**) زانایەك بە ناوی (**الشهاب بن الليودي**) لە ڕیزی مامۆستاكانی خۆیدا ناوی هێناوە. ئیمامی سەخاویش دەرسی لا خوێندووە.

لە مانگی صەفەری ساڵی (٨٦٧)ی كۆچی لە شاری (**دمشق**) كۆچی دوایی كردووە، ولە گۆڕستانی (**باب توما**) لە نزیك گۆڕی شێخ (**رسلان**)[1] ئەسپەردەی خاك كراوە.[2]

## ٩- (زاهدة الطاهري)

ناوی زاهدەی كچی محمدی كوڕی عبد الله ی (**طاهري**)یە، لە فەرمووده ناسیدا گەیشتۆتە پلەی (**محدثة**)، لای چەند زانایاك ئیجازەی زانستی وەرگرتوە، وەكو: (**ابن الجميزي**[3]، **والشاوي**، وكەسانی تریش)، گوێی لە

---

(١) دەوترێت كە ناوی (أرسلان)بووە، كوڕی يعقوب ی كوڕی عبد الرحمن ی جەعبەری دیمەشقیە، یەكێك بووە لە خواناسە دونیا نەویستەكان، لە ساڵی (٥٤٠)ی كۆچی وەفاتی كردووە، كتێبێكی زۆر بەناوبانگی داناوە بە ناوی: (رسالة التوحيد). بڕوانە: (هدية العارفين/ ١/ ١٩٣). (وەرگێڕ)

(٢) الضوء اللامع/ ٦٠٦، وأعلام النساء/ ١/ ٥٦.

(٣) ناوی (علي بن هبة الله ابن سلامة بن المسلم الإمام بهاء الدين أبو الحسن اللخمي ابن الجميزي المصري الشافعي) یەكێكە لە قورئانخوێنە وتاربێژە ناودارەكان، لە ساڵی (٥٥٩) لە میصر لە دایك بووە، ولە تەمەنی دە ساڵیدا تەواوی قورئانی لەبەر كردووە، وە لە (٢٤)ی (ذي الحجة)ی ساڵی (٦٤٩) كۆچی دوایی كردووە لە تەمەنی زیاد لە (٩٠) ساڵ. بڕوانە: (معرفة القراء الكبار للذهبي/ ٢/ ٦٥١). (وەرگێڕ)

(ابراهیم ی کوڕی خەلیل) گرتووە، یەکێك لە زانایان بە ناوی (المقاتلي)ەوە[1] لە ڕیزی مامۆستاکانی خۆی ناوی هێناوە، یەکێکی تریش بە ناوی (الواني)[2] دەرسی لەلا خوێندوە. لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا وەفاتی کردووە.[3]

## ١٠- زينب الجرجانيه

ناوی زەینەبی کچی عبد الرحمن ی کوڕی حەسەنی جورجا نییە، بە نازناوی (ابنە الشعری) ناسراوە، بەم نازناوانەش ناسراوە: (حرّة، وعالمة، وفاضلة، ومحدثة، وجليلة).

لە ساڵی (٥٢٤)ی کۆچی لە نەیسابوور لە دایك بووە، وبە خزمەت کۆمەڵێك زانای ناودار گەیشتوە، وئیجازەی زانستی وگێڕانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) لێ وەرگرتوون.

هەندێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) لەم زانایانە بیستوە: (ابو محمد إسماعيل بن ابي القاسم بن ابي بكر النيسابوري القارئ، وابو القاسم زاهر، وابو المظفر عبد المنعم بن عبد الكريم بن هوزان القشيري، وابو الفتوح عبد الوهاب بن شاه الشاذياضي، وابو البركات محمد بن الفضل الفزاري، کەسانێکی تریش)

---

(١) ناوی (فخر الدين عثمان بن لبان المقاتلي الدمشقي الكفتي)ە، وپلەی (محدث)ی هەبووە، وچەند ساڵێك لە میصردا ژیاوە، لە ساڵی (٦٧٥) لە دایك بووە، ولە ساڵی (٧١٦) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: (الوافي في الوفيات/ ١/ ٢٨٣٦). (وەرگێڕ)

(٢) ناوی شرف الدين عبد الله ی کوڕی محمدی کوڕی إبراهیمی دیمەشقیە وحەنەفی مەزهەبە، (محدث)ە، وبە (الواني) ناسراوە، لە ساڵی (٧٤٩) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: (هدية العارفين/ ١/ ٢٤٢). (وەرگێڕ)

(٣) الدرر الكامنة لابن حجر/ ٢/ ١١٢.

چەند زانایەکی فەرمووده‌ناسیش ئیجازەیان پێ داوە، وەکو: (الحافظ أبو الحسن عبد الغفار بن إسماعيل بن عبد الغافر الفارسي، والعلامة الخرقي، کەسانێکی تریش)

یەکێك لە زانایان بە ناوی (علي المقدسي) هەندێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) لێ گێڕاوەتەوە.

زانایەکی تر بە ناوی (الحسن بن محمد بن محمد البكري) گوێی لە بەشێکی کتێبێکی گرتوە کە کۆمەڵێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) تێدایە کە ئەم سێ زانایە گێڕاویانەتەوە: (ابو عمرو إسماعيل بن محمد بن احمد السلمي، وعثمان بن عبد الرحمن بن الصلاح)

هەروەها ئەو زانایە تەواوی بەشی سێیەمی کتێبی (الزهد)ی (وكيع بن الجراح) لەلای ئەو خانمە گوێ لێگرتووە، هەروەها گوێی لە کتێبی (الأربعين)یش گرتوە کە ئەو خانمە خۆشی گوێی لە (فاطمة بنت البغدادي) گرتووە وگێڕاویەتیەوە، بە ئیجازەش لە (الصاعدين)ی وەرگرتووە. هەروەها گوێی گرتوە لە بەشی دەیەمی کتێبی (الفوائد) کە دانراوی (الحاكم محمد بن محمد بن أحمد النيسابووري)ە کە ئەو خانمە خۆی لێی گێڕاوەتەوە، گوێشی لێ گرتوە لای (ابو القاسم زاهر بن طاهر بن محمد الشحامي). تەواوی بەشی یەکەم ودووەمی (حديث علي بن حرب)ی بە ئیجازەوە بەسەردا خوێنراوەتەوە.

لە شاری نەیسابوور لە مانگی (جمادي الآخر) لە ساڵی (٦١٥)ی کۆچی وەفاتی کردووە.[١]

---

(١) أعلام النساء/ ٢/ ٧٥.

# بەشی پێنجەم

## ئافرەتگەلێك كە دەسەلاتی جێبەجێ كردنیان گرتۆتە دەست

زۆرن ئەو ڕیوایەت و ئاسارانەی كە باس لە گرتنەدەستی ژنان دەكەن بۆ دەسەلاتی جێبەجێ كردن، یان دەسەلاتی پۆلیسی، كە لە كلتوور وكتێبە فیقهیەكاندا بە (**الحسبة**) ناودەبرێت، ئەویش لە سەدەی یەكەمی كۆچیدا بووە، جا بەپێی بوونی ئەو هەوالانە، هەندێك لە زانایان ڕێگەیان داوە بەوەی كە ئافرەت ئەم پۆست وپێگە هەستیار وسەركردایەتیە لە دەولەتی ئیسلامیدا بگرێتە دەست.

وەكو (ابن حزم) باس دەكات، وبەلگە بە هەوالی ئافرەتێك بە ناوی (**الشفاء**)وە دەهێنێتەوە، ودەفەرموێت: ((درووستە كە ئافرەت دەسەلاتی فەرمانڕەوایی بگرێتە دەست، كە ئەمە وتەی ئەبو حەنیفەیە، ئیمامی عومەری كوڕی خەتاب دەگێڕێتەوە كە ئافرەتێكی بە ناوی (**الشفاء**)وە كردۆتە بەرپرس وچاودێری بازاڕ.

جا ئەگەر بوترێت: خۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (**لن يفلح قوم اسندوا أمرهم إلى امرأة**)!

ئێمەش دەلێین: كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەهای فەرمووە بۆ ئەوەیە كە ئافرەت نابێت فەرمانڕەوایی گشتی بگرێتە دەست، كە بریتیە لە خەلیفایەتی، بە بەلگەی ئەوەی كە خۆی دەفەرموێت: (**المرأة راعية على مال**

**زوجها، وهي مسؤولة عن رعيتها.)**[1]، هەروەها زانایانی مەزهەبی ئیمامی مالیك بە درووستی دادەنێن کە ئافرەت ببێتە: **(وصية و وكيلة)**، لە هەمان کاتیشدا دەقێکیش نییە کە ڕێگری لەوە بکات کە ئافرەت سەرپەرشتی هەندێك کاروبار بکات)).[2]

ئیمامی **(ابو بلج يحيى بن ابي سليم الفرازي الكوفي _ وقيل الواسطي)** دەگێڕێتەوە، ودەڵێت: ((چاوم کەوت بە سەمرائی کچی نوهەیك، کە یەکێك بوو لەوانەی کە بە خزمەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەیشتبوو، جلێکی سەربازی ئەستووری لەبەردا بوو، پەچەیەکی ئەستووریشی بەسەر دەمو چاویدا دادابوو، قامچییەکیشی بە دەستەوە بوو، کە خەڵکی پێ تەربێت دەکرد، وفەرمانی دەکرد بە چاکە ونەهی دەکرد لە خراپە)).[3]

---

(١) البخاري/ كتب الجمعة/ باب الجمعة في القرى والمدن/ ٨٥٣، وابن حبان/ كتاب السير/ باب في الخلافة والإمارة/ ٤٤٩٠، والبيهقي في السنن الكبرى/ كتاب الوديعة/ باب ما جاء في الترغيب في أداء الأمانات/ ١٢٤٦٦، والنسائي في السنن الكبرى/ كتاب عشرة النساء/ مسألة كل راع عما استرعى/ ٩١٧٣.

(٢) المحلى لابن حزم/ ٩/ ٤٢٩ _ ٤٢٠.

(٣) الطبراني في المعجم الكبير/ مسند النساء/ باب السين/ سمراء بنت نهيك/ ٧٨٥، وذكره ابن عبد البر في الاستيعاب/ ٤/ ١٨٦٣، والهيثمي/ في مجمع الزوائد/ ٩/ ٢٦٤، وقال رواه الطبراني، ورجاله ثقات.

# کۆتایی

## ئافرەت بەلای ناموسوڵمانەکانەوە، لە کۆن و نوێدا

ئافرەت بەر لە هاتنی ئاینی ئیسلام، لە هەموو شارستا نییەتە کۆنەکاندا ستەم لێ کراو وبێ ڕێز بووە، ئیتر لە شارستانێتی ئەوروپای کۆن یان ڕۆما نییەکان، یان فارسەکان، یان عەرەبەکانی بەر لە ئیسلام، هەرکام لەو شارستانێتیانە کە تێپەڕیوە، چەندەها جۆر سزا ونەشکەنجە وستەم وچەوساندنەوەیان بەسەر ئافرەتدا هێناوە.

- ئیغریقیەکان بە دارێکی ژەهراویان زانیوە، ودەیانوت: شتێکی پیسە وبەشێکە لە کار وکردەوەی شەیتان.
- ڕۆمانییەکان دەیانگوت: ئافرەت ڕۆحی نییە، جۆرێك لەو جۆرانەی کە سزایان پێ دەدا، ئەوەبوو کە ڕۆنی گەرم وداخ کراویان دەکرد بە سەر سەریدا. دەیان بەست بە ئەسپەکانەوە وڕایان دەکێشا تاوەکو گیانی دەردەچوو.
- صینییەکانیش دەیانگوت: ئافرەت ئاوێکی بە ئازارە، وبەختەوەری دەشواتەوە، بۆ هەموو صینییەکیش هەیە کە خێزانەکەی (هاوسەرەکەی) زیندە بەچاڵ بکات. ئەگەر مێردەکەشی بمرێت، ئەوا خزم وکەسو کارەکانی وەك میرات ژنەکەی دەبەن.
- هیندیەکانیش بەرامبەر بە ئافرەت دەیانگوت: نە مردن ونە جەهەنەم و نە ژەهر ونە مار ونە ئاگر هیچیان لە ئافرەت خراپ تر نین، بەڵکو بەلای

ئەوانەوە ئافرەت ئەگەر مێردەکەی بمرێت ئەویش مافی ژیانی نامێنێت، بەڵکو دەبێت لەگەڵ ئەودا بسووتێنرێت.

- فارسەکان: بە ڕەوایان دانابوو کە هەموو ئافرەتێك مارە بکرێت، باوەکو مەحرەمیش بێت، بەبێ هیچ ئیستیسنایەك، درووستە بۆ پیاوی فارسی کە فەرمانی مردن بدات بەسەر هاوسەرەکەیدا.
- یەهودیەکان دەیانگوت: ئافرەت نەفرەتی خوایە، چونکە هۆی بەدبەختی و سەرلێشێوانە، لە کاتی عادەی شەرعیدا شتێکی پیسە، درووست بوو بۆ باوکی کە بیفرۆشێت.
- بەلای مەسیحیەکانیشەوە حاڵی لەوانەی ڕابوردوو باشتر نەبوو. ئەوەتا فەرەنسیەکان لە ساڵی (٥٨٦)ی زاینیدا کۆنگرەیەکیان بەست بۆ باسی ئەوەی کە:

١. ئایا ئافرەت بە مرۆڤ دادەنرێت یان نا؟!
٢. ئایا ڕۆحی هەیە، یان نا؟!
٣. ئەگەر ڕۆحی هەبێت، ئایا ڕۆحی مرۆڤانەیە، یان ڕۆحی ئاژەڵیانەیە؟!
٤. ئایا ئەگەر ڕۆحی مرۆڤانە بێت، ئایا لە هەمان ئاستی ڕۆحی پیاودایە یان نزمتر؟!

وە لە کۆتاییشدا بڕیاریاندا کە بەڵێ مرۆڤە!! بەڵام تەنها بۆ خزمەت کردنی پیاو درووست کراوە!!.

وە پەرلەمانی ئینگلیزیش لە سەردەمی پاشا (هنری هەشتەم) بڕیارێکی دەرکرد کە: بۆ ئافرەت ناڕەوا وقەدەغەیە کە کتێبی (العهد الجديد) (واتە: ئینجیلە دەسکاری کراوەکە) بخوێنێتەوە، چونکە ئافرەتیان بە پیس دادەنا.

بەلای عەرەبەکانی بەر لە ئیسلامیشەوە ستەم کردن لە ئافرەت گەیشتبووە رادەیەك کە هەر بە زیندوویی دەیان نایە چاڵەوە، یان فڕیان دەدایە ناو بیرێکەوە بە شێوەیەك کە دڵی مرۆڤی بە ویژدانی دەتواندەوە.

یەکێك دەپرسێت: خۆ ئەمانەی کە باسکران هەمووی لە سەردەمانی کۆندا بووە، وڕابووردووە، هەر ئەوانەش وەها کردووە کە کەسانێك بە درۆ داوای مافەکانی ئافرەت بکەن، بەلام ئەوەی کە جێگەی سەرسووڕمانە ئەوەیە کە: ئافرەت لە شارستانێتیەکانی تری نائیسلامیدا تاوەکو ئێستاش هەر سووکایەتی پێ دەکرێت، بە هەموو پێوەرەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان، وکۆمەڵەکانی مافەکانی مرۆڤ.

بۆ نموونە: دۆسیەی توندو تیژی کردن دژی ئافرەتان، ئازاردانی جەستەییان، بە پێی ئەو سەرژمێریانەی کە تایبەتن بە توندوتیژی دژی ئافرەتی ڕۆژئاوایی _ کە لە باسەکانی پێشوودا لە بابەتە جیاجیاکاندا ئاماژەمان پێدا _ ئەم دەرئەنجامانەی خوارەوەی لێ دەکەوێتەوە:

- (٧٥٪)ی پیاوان لە ئەمەریکا بە جۆرێك لێدانی هاوسەرەکانیان دەکەن، کە تووشی نوقسانی وبەلایان دەکەن.
- (١٧٪)ی ئەو ئافرەتانە حاڵەتیان وەها دەخوازێت کە بخرێنە ژێر چاودێری وردەوە.... ئەم زانیاریە لە لایەن دکتۆر (**جون بیریە**)یەوە نووسراوە، کە پرۆفیسۆری یاریدەدەری وانەی زانستی دەروو نییە لە زانکۆی (**کارولینا**).
- بە پێی ڕاپۆرتی دەزگای ناوەندی ئەمەریکی بۆ توێژینەوە وپشکنین (FPT) هاتووە کە: هەموو هەژدە چرکەیەك ئافرەتێك لە لایەن مێردەکەیەوە لێدان دەکرێت.
- ڕۆژنامەیەکی ئەمەریکی نوسیوێتی: لە هەموو دە ئافرەتێدا یەکێکیان لە لایەن مێردەکەیەوە لێدان دەکرێت، ئەوجا ڕۆژنامەی ( Family

Relation) لەسەر ئەم هەواڵە دەڵێت: هەر ئافرەتێك لە دوو ئافرەت لە لایەن مێردەكەیەوە لێدان دەكرێت، وستەم ودەست درێژی دەكرێتە سەر.

- دكتۆر (جون كیشلر) كە یەكێكە لە زانایانی زانستی دەروونی لە شیكاگۆ لە ئەمەریكا زۆر بە ڕاشكاوانە دەڵێت: (٩٠٪)ی ئافرەتانی ئەمەریكا تووشی سستی وساردی جینسی بوون، (٤٠٪)ی پیاوانیش تووشی نەزۆكی بوون. هەروەها دەڵێت: ئەو ریكلام وئاگادارییانەی كە پشت بە وێنەی ئافرەتی ڕووت دەبەستن، هەر ئەوانی هۆكاری دابەزینی ئاستی جینسی لای گەلی ئەمەریكا.[1]
- لە فەرەنسا ساڵانە دوو ملیۆن ئافرەت ڕووبەڕووی لێدان دەبنەوە... متمانەداری نهێ نییەكانی وڵات بۆ مافەكانی ئافرەت (میشیل أندریە) وتوویەتی: هەندێك جار ئاژەڵەكان مامەڵەی باشتریان لەگەڵدا دەكرێت، وەك لە ئافرەتان. خۆ ئەگەر پیاوێك لەسەر شەقامێك بدات لە سەگێك، ئەوا كەسێك شكاتی لێ دەكات لای كۆمەڵەی بەنەرمی جووڵانەوە لەگەڵ ئاژەڵ، بەڵام ئەگەر لەسەر شەقامێك لە ژنەكەی خۆی بدات، ئەوا یەك كەس جووڵە ناكات. (واتە كەس خۆی لە مەسەلەكە ناگەیەنێت).
- (٩٢٪)ی كاری لێدان لە شارەكاندا ڕوو دەدات، (٦٠٪)ی ئەو شكاتانەی كە بەشەودا دەگاتە پۆلیسی فریاكەوتنی پاریس بریتین لە هاناهێنانی ئافرەتان لە دەست خراپی مامەڵەی مێردەكانیان.
- لە بەریتانیا ڕاپۆرتێك هاتووە لەسەر ئەوەی كە (٧٧٪)ی مێردەكان هەر بەبێ هۆ لێدانی ژنەكانیان دەكەن.

---

(١) ئەوەی شارەزایی زیاتری دەوێت، با بگەڕێتەوە بۆ ڕاپۆرتی لیژنەیەكی كۆنگرێسی ئەمەریكی بۆ لێكۆڵینەوە لەسەر تاوانەكانی گەنج ومێرد منداڵەكان لە ئەمەریكا، لە ژێر ناونیشانی: (ڕەوشتی داهەڕۆزاوی كۆمەڵگای ئەمەریكی). ئەم زانیارییەش لە كتێبی: (المجتمع العاري بالوثائق والأرقام/ ص١١)ەوە هێنراون.

- هەروا لە بەریتانیا زیاد لە (٥٠٪)ی ئافرەتە کوژراوەکان بریتی بوون لە قوربانی دەستی مێرد یان دۆستەکانیان، توندوتیژی خێزانی زیادی کردووە بە ڕێژەی (٤٦٪) لە ساڵێکدا هەتاوەکو کۆتایی مانگی ئازاری ساڵی (١٩٩٢). هەروەها دەرکەوتوە کە (٢٥٪)ی ئافرەتان ڕوو بەڕووی لێدان دەبنەوە لە لایەن مێردەکانیان یان دۆستەکانیانەوە. پۆلیسی بەریتانی ساڵانە (١٠٠,٠٠٠) سەد هەزار پەیوەندی تەلەفوونی پێ دەگات، کە ئاگادار دەکرێتەوە لەسەر دەستدرێژی کردنە سەر ژنان (زوجات أو شریکات). هەر ئەو ڕاپۆرتە ئەوەشی تێدایە کە ژنێك باسی ئەوەی کردووە کە لەسەرەتای شووی کرد نییەوە، مێردەکەی سێ ساڵ ونیو لێی داوە، وتیشی: ئەگەر دوای لێدانەکە قسەم بکردایە، دووبارە لێی دەدامەوە، بۆیە هەروا بێ دەنگ بووم، خۆ ئەو تەنها بە یەك جۆر لێدان واز ناهێنێت، بەڵکو هەموو جۆرەکانی بەکار دەهێنێت، وەکو: بەدەموچاودا کێشان، مشتەکۆڵە، شەق، لەقە وخستنە ژێر پێ، کێشانی سەر بە دیواردا. هەندێك جار پیاوانێك هەبوون کە جگەرەیان بە لاشەی ژنەکانیان کوژاندۆتەوە، یان بە زنجیر وکۆت لە ماڵدا کۆتیان کردوون، پاشان دەرگایان لەسەر داخستوون، وچەند کاتژمێرێکی زۆر بەم جۆرە بەجێیان هێشتوون.

جا لەم کورتە باسەی پێشەوە کە خستمانە ڕوو لە بارەی چۆنێتی مامەڵە کردن لەگەڵ ئافرەتدا لە لایەن ناموسوڵمانەکانەوە، ئیتر لە شارستانێتیە زۆر کۆنە بەسەرچووەکان، یان لەم چەرخە تازەی ئێستامان، ئەو ڕاستیە گرنگەمان بۆ دەردەکەوێت کە: ڕۆژئاوا، یان هەر شارستانێتیەکی تر، بەهۆی ئەوەی کە هەندێك ڕەفتاری ناباویان لێوە دەردەکەوێت، کە لە پلە وبەهای ئافرەتان کەم دەکەنەوە _ وەکو ڕابوورد _، هیچکام لەو شارستانێتیانە ناگونجێن ودەست

